پرۆژەی تیشك -46

# فڕێ فڕێ قەل فڕێ

**نووسینی:**

**مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی**

**(مەلای گەورە)**

**قانع خورشید**

پێشەکی بۆ نووسیوەو ڕێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە

**2009-1430**

**ناوی کتێب:** فـڕی فـڕی قـەل فـڕی

**نووسینی:** مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە)

**ژمارەی سپاردن:** ژمارە (١٢١٩) ساڵی (٢٠٠٩)

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** ٢٠٠٩

**نەخشەسازیی بەرگو ناوەوە:** فازل قەرەداغی

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، ژمارە (٤٦)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:**

www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:**

info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

# پێشەکییەکی کورت
# لە بارەی
# ژیانی (مەلای گەورەی کۆیە)و ئەم بەرهەمەیەوە..

نووسینی:

**قانع خورشید**

بسم الله الرحمن الرحيم

## کورتە باسێك
## لەبارەی ژیانی مەلای گەورەوە

ناوی (محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی کاك ئەسعەدی جەلی کۆیی)ە، کونیەکەی (ئەبو مەسعود)ە، نازناوی (کمال الدین)ە. لە سەرەتای ژیانیەوە بە(کاك حەمەد) ناوبانگی دەرکردبوو، دوای کۆچی دوایی باوکی سەرۆکایەتی زانایانی ناوچەکەی خۆیانی گرتووەتە ئەستۆ، بۆیە بە(مەلای گەورە) شوهرەتی بڵاوەی کرد، تا وای لێهات بەم ناوبانگەی لە ناوی خۆی زیاتر ئەناسرایەوە، هەروەك ناو و شۆرەتی بە(جەنابی مەلا)یش بڵاوەی کردبوو[١]..

لە سەرەتای مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٢٩٣ی کۆچی بەرامبەر ١٨٧٦ی زایینی لە شاری کۆیە لە دایك بووە، لە کۆشی خێزانێکی دێرینەی پڕ لە زانست و تەقوادا گەشەی کردووە، باو باپیرانی هەموو زانا و دانا و شارەزا بوون و بنەماڵەیەکی ناوداری ناوچەکە بوونە و خزمەتێکی زۆری زانست و ڕۆشنبیری و ئایینییان کردووە، بنەماڵەی جەلیزادە زۆر ناسراو و ناودارن و باسکردنی پلەوپایە و ڕێز و شکۆ و خزمەتیان زۆری ئەوێ[٢].

مامۆستا محەمەدی جەلی _مەلای گەورە_ هەر لە منداڵییەوە بەهۆی زیرەکی و بیرتیژی خۆیەوە زۆر لە دڵی باوکیدا شیرین و خۆشەویست بوو، باوکی

---

[1] ) مد بن عبدا ا لمي وجهوده العلمية، د.جواد فقي علي: ١٠٢.
[2] ) هەمان سەرچاوە: ١٠٢ ـ ١٠٣.

گرنگییەکی تایبەتی پێ ئەدا، تەمەنی پێنج ساڵ بوو دایکی وەفاتی کرد، ئیتر باوکی لە پێشتر زیاتر گرنگی پێئەدا، تا وای لێ هاتبوو پێیان ئەوت (ئەمە یوسفی مەلا عەبدوڵڵا)یە، باوکی چەندین دێڕە شیعریشی بۆ نووسیوە کە هانی ئەدەن بۆ فێربوون و دینداری و باوەڕبتەوی [٣].

مەلای گەورە لەساڵی ١٣٠٣ی کۆچییەوە ــواتە لە تەمەنی دە ساڵییەوەــ دەستی کردووە بە خوێندن و فێربوون و سەرەتا بە خوێندنەوەی قورئان و خوێندنەوەی چەند نامیلکەیەکی فارسی دەستی پێکردووە.

پاش ئەم قۆناغە دەستی کردە خوێندنی زانستەکانی ( **و، صرف، فقە**) لای موستەعیدەکانی باوکی.. لای چەندین مامۆستا خوێندوویەتی، لە هەموو مامۆستاکانی زیاتر کە کاریگەرییان بەسەریەوە هەبووێ مامۆستا (مەلا محەمەد ئەمینی کونەفلوسی)یە، کە مەلای گەورە خۆی لە تەفسیرە کوردییەکەیدا ئەڵێ: ئەو دڵمی کردەوە و تێیگەیاندم و وەك پێویست دەرسی دام [٤].

هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە ئەوە ئەبینرا کە زۆر پشت بە خۆی ئەبەستێ و پشت بە کەسی تر قایم ناکا و هەوڵ ئەدا کەسایەتییەکی سەربەخۆی هەبێ، زۆریش هەوڵی ئەدا بۆ فێربوون و ماندوو نەناسانە لەو پێناوەدا ئەکۆشا و وازی لە هەموو خۆشی و رابواردنێکی دونیایی هێنابوو، هەروەك خۆی ئەڵێ:

دەرگەی لەزەتم لەسەرخۆ بەست      چی علوم هەبوو بەدەستم خست

لەم تەمەنەیدا هەر لە مزگەوت بووە و بەقسەی خۆی هەنگاوێکیش لە

3 ) هەمان سەرچاوە: ١٠٣.

4 ) هەمان سەرچاوە: ١٠٣ ـ ١٠٤.

مزگەوت نەچووەتە دەرەوە و لە درەنگانی شەویشدا هەڵئەسایەوە و لە نێو تاریکی ئەنگوستەچاوی مزگەوتدا لە بوونەوەر ڕادەما و بیری دەکردەوە، لەم ساڵەی تەمەنیدا هەندێ کەرامەتی بۆ دەرکەوتووە و نوورێکی سەوز هەموو شەوێك حەرەمی مزگەوتەکەی بۆ ڕووناك کردووەتەوە، تا بەهۆی خواردنی لوقمەیەك نانی حەرامەوە ئەم ئاسودەییەی لەدەست داوە[5]!

بەهۆی ئەم خۆ یەکلاکردنەوەیەوە بۆ فێربوون هەر بە لاوی و لە هەرەتی گەنجێتیدا ئیجازەی علمی وەردەگرێ و دەبێ بە مەلا و لەجێی باوکی دەرس دەڵێتەوە و ئامۆژگاری خەڵکی دەکات بۆ چاکە و خێرکردن.

تا تەمەنی ٣٢ ساڵی ئاگای لە بەرپرسیارییەتی ماڵ نەبووە، بەڵام دوای ئەوەی لە ساڵی ١٣٢٦ك _١٩٠٨ز باوکی بەڕێزیان (مەلا عەبدوڵڵای جەلی) کۆچی دوایی دەکات ئیتر باری ئەم گران ئەبێ و ناچار ئەبێ شان بەشانی دەرس وتنەوە خەریکی بەڕێوەبردنی کێڵگەکەیان بێت، هەندێ ناحەزیش هەبوون کە زۆر جار پاشقولیان ئەدا و تەگەرەیان ئەهێنایە ڕێی، ئەمانەش هەندێ بەرپرسی گەندەڵ و تەڵەکەبازانی تەریقەت و شێخایەتی بوون[6].

لەساڵی ١٩١٢ز بە ڕاسپاردنی حکومەتی عوسمانی ئەرکی فەتوادانی پێ سپێررا و بە ماوەیەکی کەم ناوبانگی ئەوەندە بڵاوەی کرد کە لە هەموو لایەکەوە خەڵکی دەهاتنە لای بۆ پرس و ڕا، تەنانەت لە ئێرانیشەوە بۆ فەتواوەرگرتن دەهاتنە خزمەتی[7].

---

5 ) محمد بن عبدالله الجلی: ١٠٥ ـ ١٠٦.

6 ) سەرچاوەی پێشوو: ١٠٨.

7 ) هەمان سەرچاوە: ١٠٨.

چەندین ئەرکی حکومەتیشی پێ سپێرراوە، لەساڵی ١٩١٥ز بوو بە ئەندام لە ئەنجوومەنی ویلایەتی موسڵ، هەروەك لـە سـاڵی ١٩١٩ز لـە چواری کـانوونی دووەمدا وەك دادوەری شاری کۆیە دامەزرا و دە ساڵ لەم پۆسـتەدا مایـەوە. لـە ساڵی ١٩٢٤دا وەك ئەندامی (ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراق)ی هەڵبـژێررا لـە مانگی ئازاردا و تا مانگی ئاب لە بەغدا مایەوە، پاشان گەڕایـەوە کۆیـە و لـە قازییەتی خۆی بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩٢٧ کە وازی هێنا[٨].

ساڵی ١٩٣٠ بە ساڵی پێگەیشتن و کـامڵبوونی فیکـری و فەلـسەفی مـەلای گەورە دادەنرێ، چـونکە لـەو تەمەنـەدا زۆربـەی زانـستەکان فێربـوو و گەشـتە پلەیەکی بەرز لە فەلسەفەدا، لەو ساڵە بەدوا دەستی دایە تەفسیرە نایابەکەی بۆ قورئان[٩].

## چەند سیفات و ڕەوشتێکی مەلای گەورە:

بالآی لە درێژ بە خوار و لە ناوەند بە ژوور بوو، سـینە و نێوچـاوانی بـەرین بوو، لووتی زل بوو، چاوی پان و سەیرکردنی تیژ بوو، ڕیشی پڕ و برژانگی ڕەش بوو، زۆر بەسام و هەیبەت بوو، کەم تـووڕە و لەسـەرخۆ بـوو، بـەردەوام کـۆڕی جمەی دەهات لە میوان و زانا و کەسانی بەڕێزدا، خۆش ڕەفتار و شیرین گوفتـار و قسەخۆش بوو، هەرکەس دەیبینی بەدەستی خۆی نەبوو ڕێزی دەگـرت، کـەس نەیدەوێرا نە بە ئاماژە و نە ڕاستەوخۆ بیشکێنێتەوە یان بەرپەرچی بداتەوە.

باوەڕی زۆر قایم بوو، دەستی بە هەق و ڕاستییەوە بوو، لە خوا زیاتر لە کەس

[8]) هەمان سەرچاوە: ١٠٩ و ١١٠ و ١١١.

[9]) هەمان سەرچاوە: ١١١.

نەدەترسا.. کە چەند نموونەیەکیش لە ژیانی بگێڕینەوە زیاتر ئەم حەقیقەتانە ڕوون ئەبێتەوە و سیفاتی تریشی دەرئەکەوێ، هەروەك زۆر ڕقی لە خورافیات و چاوبەستی شێخانی تەریقەت بوو، ئەمەش کێشەی زۆری بۆ ئەنایەوە [10].

بەهۆی نەخۆشی قورحەی گەدەوە، کە لە گەنجێتییەوە هەیبوو، لە کۆتایی ئەیلولی ساڵی ١٩٤٢دا حاڵی خراپ بوو، لە چنارۆکەوە هێنایانەوە کۆیە و لە ١٢/١٠/١٩٤٣ز ـــ ١٣٦٢ك بەهۆی خوێن بەربوونێکی زۆرەوە گیانی سپارد.. هەر کە هەواڵی کۆچی دوایی مەلای گەورە بڵاو بوویەوە هەموو دوکانەکانی شار داخران و شاری کۆیە شڵەژا و خەڵکی زۆر خەفەتبار بوون.. سەدان کتێب و دەسنووس و شوێنەواری دوای خۆی بەجێهێشت.. لە گۆڕستانی دەروێش خدر لاشەی پیرۆزیان ناشت [11].

## شوێنەوار و نووسینەکانی مامۆستا مەلای گەورە [12]:

١ ـــ تەفسیری کوردی لەسەر کەلامی خوداوەندی... دیارترین نووسینی مامۆستایە کە نزیکەی شەش هەزار لاپەڕەیە و مامۆستا دە ساڵی تەواو لە ١٩٣٣وە تا١٩٤٣ خەریکی دانانی ئەم بەرهەمە بێ وێنەیە بووە، دوو بەرگی لەساڵی ١٩٦٨و١٩٧٠ لێ چاپکراوە، بەڵام ئێستا لە پرۆژەیەکی گرنگدا (نووسینگەی تەفسیر) خەریکی ڕێکخستن و لەچاپدانی هەر سی جوزئەکەین. یەکێك لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی ئەم تەفسیرە بەگژاچوونی خورافییات و ئیسرائیلییەکانە کە مانای قورئانی شێواندووە و تەفسیرە گەورەکانی وەك

---

[10] ) محمد بن عبدالله الجلی: ١١٢.

[11] ) هەمان سەرچاوە: ١١٣ ـ ١١٤.

[12] ) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو لە لاپەڕەی ٢١٣ تا ٢٥٥.

**(الط ي)** و **(ابن كث )**یش لێی قوتاریان نەبووە.

٢_**أ ى ا آرب اثبات الواجب.**

٣_ **الإله والطبيعة والعقل والنبوة.**

٤_ **التكميل وجوب الفرق ب ا مكن وا ستحيل.**

٥_ **ا دس سُلّمُ الإرتقاء.**

٦_ **حقيقة الإسلام والإ ان والإحسان.**

٧_**خراب العا .**

٨_ **ستة أشخاص.** كە باسی ئەم شەش کەسایەتییە ئەکا: (عیسی، پێشەوا علی، دەجال، خضر، ئیلیاس، مەهدی).

٩_ **ضياعان: ضياع ا ياة، ضياع الدين (دين الاسلام).**

١٠_ **غاي وأملي علمي وعملي.**

١١_ **القائد ا العقائد.**

١٢_ **الكلام ا ديد.**

١٣_ **مسألة الإختيار.**

١٤_ **ا شاهد.**

١٥_ **ا عجزات والكرامات.**

١٦_ **مقالة فيق صفة الكلام.**

١٧_ **ا صقول علم الأصول.**

١٨_ نوێ کەرەوە.

١٩_ حیکایەت، خەون، کەرامەت.

٢٠_ عەقیدەی کوردی.

٢١_ فڕی فڕی قەل فڕی: ئەم نامیلکەیە کەوا پێشەکی بۆ ئەنووسین، إن شاء ا کەمێکی تر هەندێ قسەی لەسەر ئەکەین.

٢٢_ دیاری مەلا محەمەدی کۆیی: کە دیوانێکی شیعرییە و شیعرەکانی مەلای گەورەی تێدایە، مەلای گەورە شاعیرێکی بە توانا بووە و زۆربەی شیعرەکانیشی لە تەمەنێکی کامڵبووندا نووسیوە، بۆیە کەمتر عاتیفە و سۆزی تێدا ئەبینرێ، زیاتر ڕوونکردنەوەی عەقڵی و وریاکردنەوە و هۆشیاری کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیرییە.

دوای ڕوونکردنەوەی هەندێ لایەنی ژیان و کەسایەتی مامۆستا محەمەدی کۆیی _مەلای گەورە_ هەوڵ ئەدەم چەند دێڕێك لەسەر نامیلکەکەی بەردەستمان بنووسم و هەڵوێستی مامۆستاش لە بارەی شێخ و سۆفییەوە ڕوون بکەمەوە و چەند دێڕە شیعرێکیش لە دیوانەکەی بهێنمەوە.

## چەند لایەنێك لە کەسایەتی مەلای گەورە:

١_ مامۆستا مەلامحەمەدی کۆیی دیارترین سیفەتی: یەکلابوونەوە بوو بۆ حەق، ئەو ئەوەندە ساغ و ڕاستگۆ بووە لەگەڵ بیرو باوەڕەکانی خۆیدا و بەری بووە لە درۆ و چاوبەس کردن، کە کەسانی دەوروبەری جیاوازیەکی ئەوتۆیان لە ژیانی ماڵ و دەر و مزگەوت و بازاڕیدا نەکردووە، بیریاری گەورە مەسعود محەمەدی کوڕی مەلای گەورە دەربارەی باوکی ئاوا ئەڵێ: "باوکم لە دەرووندا ئیمانی بە(حەق) هێنابوو، لەو ئیمانەدا تێکڕای بوونەوەر لە بەرچاو و لەبار تەبعی جۆرێك لەنگەری بەستبوو، کە ئیتر گۆڕانی باری نەدەگۆڕا.. لە ماڵەوە و لە

مزگەوت و لە نێوان ئاپۆرەی خەلق و لای دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات یەك زەرِرە فەرق بە قسە و بە رەفتاری نەدەکرا، چ لە ژووری خۆی تەنها بایە و کتێبێکی بخوێندبایەوە و چ لە دیوەخانە یان لە مزگەوت لەگەڵ خەڵق دانیشتبایە یان لە هەر هەڵکەوت و هەڵوەستی دیکەدا بایە هەمان رەفتاری دەکرد، واتە تەنها بایە و خەڵق دیار بایە بایی سەری موویەك حەرەکە و سەکەنەی نەدەگۆرا، هەر بەقەدەر ئەوەی شەرم لە سێبەری خۆی بکات شەرمی لە خەڵق دەکردەوە، من بەلای کەمەوە دە ساڵێك بەر لە وەفاتی، گەیشتبوومە تەمەنێك مانای شتان تێبگەم (٢٤ چوار ساڵی بوم کە وەفاتی کرد). لەو دە ساڵەدا بەولای هەموو سنوورێکەوە ئەم دیاردەیەی لەنگەر بەستن و نەگۆرانەم لەو مرۆڤەدا بەدی دەکرد تا ئەوەی هەندێ جار بەلای خۆشمەوە دیاردەکە نائاشنا خۆی دەنواند هەر دەتگوت بەسەر مەتەڵێکدا دەنوارم کە باشی تێناگەم"[13].

٢ــ سیفەتێکی تری ئەم زانا بلیمەتە ئەوە بووە کە سام و هەیبەتێکی زۆری بووە و هەرکەس بینیبێتی شەرمی لێ کردووە و حەپەساوە، دوور نییە خاڵی یەکەم هۆی ئەم خاڵە بێت، واتە بۆ حەق یەکلابوونەوەکەی وای کردووە کە ئەوەندە شکۆمەند و بەهەیبەت بێت، هەروەك مەسعود محەمەد ئەڵێت: "وابزانم ئەم قاڵ بوونەوەی بۆ حەق، کە گوفتار و رەفتاری یەکچوون کردبوو، یەکێك بوو لە هۆی ئەو هەیبەتەی کە لەو مەجلیسە دەنیشت ئەوی تێدا بایە، لە مەجلیسی دانیشتن بگەرێین و سەیری ئەو رێگەیە بکەین کە پێیدا دەرۆیشت، لە ماڵەوە بۆ مزگەتی گەورە دوو رێگە هەبوو، یەکێکیان بەناو بازاردا دەچوو، کە بە ناچاری

---

[13]) گەشتی ژیانم : ٢٥ ـ ٢٦ .

ئـەو ڕێگەیـەی دەگرتـە بـەر، هـەر لـە زارکـی بـازاڕەوە کـە بـۆ ئـەهلی بـازاڕ دەردەکەوت تێکڕایان هەڵدەستانە سەرپێیان تا لێیان ڕەت دەبوو، تەنانەت گـاور و جوولەکەش وەك موسولمانەکان بۆی ڕاست دەبوونـەوە، واز لـە ئـەهلی بـازاڕ بهێنن بۆ منداڵی کۆڵانەی گەڕەکی خۆی، عەسری ڕۆژانی کۆتایی بەهار و سەری هاوین کە لە ماڵەوە دەردەچوو بەرەو مزگەوتی حاجی مـەلا ئەسـعەد منـداڵی گەڕەك کە سەرگەرمی قەپوقیڕی چگێنە و تۆپێنـە بـوون هـەر کـە چـاویان پێـی دەکەوت کەلاوجگ و تۆپیان لـە دەسـتان بـەردەبۆوە و خۆیـان بـە دیـواری ئـەم بەرئەوبەری کۆڵانەوە دەگرت تـاکو لـە چـاوانیان بـزر دەبـوو. ئینجـا وردە وردە دەگەڕانەوە بۆ گەمەکانیان"[١٤].

هەر مەسعود محەمەد دیمەنێکی تری ژیانی باوکیمان بۆ ئەگێڕێتەوە کە زیاتر هەیبەت و شکۆی مەلای گەورەمان بۆ دەرئەخات، ئەڵێ: "جارێکیان ماڵمان لە چنارۆك بوو، عەسران باوکم لە ماڵەوە بـەرەژێر دەچـوو بـۆ نـاو باغـەکان، ئـەو جالاەش بە عادەتی خۆی لە باغچە بوو، من لەژێر کەپری ماڵمان راوەستا بووم، چەند کەسێك هاتن سەلامیان کرد و لە باوکمیـان پرسـی، گوتیـشیان لـە دیـوی ئێرانەوە هاتوون بۆ پرسیارێکی شەرعی.. من بـردمن بـۆ سـەراوردی باغـەکـە و ئەو شوێنەشم نیشان دان کە باوکمی لێ بوو. هەر لـە بیرمـە بـاوکم کەوایـەکی ئاودامەنی لەبەربوو، یەك هەمیانەی لە کەمەری بەسـەر کەواکـەوە بەسـتبوو، چاوم لێ بوو پیاوەکان گەیشتنە لای و سەلامیان کرد و گوێم لێ بوو گوتیان لە جەنابی مەلا دەگەڕێین. باوکم وتی: جەنابی مەلا؟ گوتیان: بـەڵێ. دوو پەنجـەی

[14]) سەرچاوەی پێشوو : ٢٦ .

دەستی ڕاستەی بردە سەر سینگی و گـوتی: جـەنابی مـەلا ئەمەتـە.. کابراکـان وەك داریان لە لـووتی بـدەی بـەرەو پـاش گەڕانـەوە و وەهـا شـلەژان بـۆ چـەند لەحزەیەك نەیانزانی چ بکەن تا هاتنەوە سەرەخۆ و چوون دەسـتیان مـاچ کـرد.. ئەم دیمەنە بـچووکە لـە بەرچـاومدا جیهـانێکی ئەفـسوناوی لـە باوەشـی خـۆی دەگـرت، هەیبـەت و شـکۆی بـاغێکی چـۆڵ بـە دەوری پیـاوێکی تـەنهای کـەوا لەبەری هەمیان لە کەمەری دار عـەسا بەدەست نەك هەر لە دڵی مندا بەڵکو لە دڵی ئەو دوو سێ پیاوە غـەریبەشدا هێندە سامناك بوو دەتگوت سێبەری بەسەر هەموو مەڵبەندەکەدا کشابوو. ئەو سێ کەسە ئەگەر لەناکاو بەسەر دەستەیەکی چەکداری زرێپۆشدا کەوتبانایە هەر هێندە دەشڵەژان"[15].

وا بزانم من هەر بەدواداچوونێك بدەم لەبارەی ئەم وەسفە واقعی و ئەدەبی و جوانەی مامـۆستا مـەسعود محەمـەدەوە ئەوا تـەنیا قسەکانی ئەو ناشیرین ئەکەم و لە جوانییەکەی کەم ئەکەمەوە...

**٣**ــ هەر بۆ حەق ساغبوونەوەی مەلای گەورە وای کردبوو ئەم پیاوە بلیمەتە زۆر بوێر و چاو نەترس بێ و لە هیچ کەس و لە هیچ کەسێ سڵ نەکا.. بڕوانە ئـەم هەڵوێستە ناوازەیەی کە مـەسعود محەمـەد بۆمانی باس ئەکا: "مـەلیك لە هەولێر پێشوازی لێ دەکرا. ئێوارە بەلەدیە لە یانەی فەرمانبەران داوەتێکی گێڕا لەسەر شەرەفی مەلیك. مەلا ئەفەندی و باوکم بۆ داوەتەکە لـە (بـاداوە)وە هـاتن بـۆ هەولێر، من منداڵێکی ١٠ــ١٢ ساڵی بووم لە خزمـەتیاندا هاتم. لەبەر دەرگەی نادی ئۆتۆمبیلەکەی مەلا ئەفەندی و هی موتەسەڕریفی هەولێر لە یـەك کاتـدا

[15]) سەرچاوەی پێشوو : ٢٦ ـ ٢٧ .

وەستان و خەڵقەکەیان لێ دابەزی. موتەسەڕریف سلاوێکی کرد و پێشی مەلا ئەفەندی و باوکم کەوتەوە بەرەو شوێنی داوەتەکە. باوکم هەنگاوی هەڵێنا و دەستی موتەسەڕریفی گرت و پێی گوت: جارێ نۆرەی ئێمەیە. موتەسەڕریف، مالّم حەقە، بەسەرەخۆی نەهێنا و گوتی: مرازم ئەوە بوو ڕێبەڵەدی بکەم نەکا ئێوە شارەزای شوێنەکە نەبن، باوکم پێی گوتەوە: باش شارەزاین و (**نشکرکم**). ئیتر مەلا ئەفەندی و باوکم لە پێشەوە و وموتەسەڕریفیش بە دوایانەوە بەرەو کۆمەڵەی داوەت کراوانەوە ڕۆیشتن، خەلقیش کە جەمبوورەی بەستبوو بە دەوری نادییەوە چاو ئەبڵەق بوون. هەر لەو داوەتەدا باوکم هێندێ قسەی بە مەلیك فەیسەڵ گوت گەلێك بەولای ڕاگرتنی موتەسەڕریفەوە بوو"[١٦].

مەسعود محەمەد دوای گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە لە ژیانی باوکی، خۆی سەرنجێکی لەسەر ئەخاتە ڕوو، نەوەك خوێنەر پەی بە مەزنی ئەم هەڵوێستە نەبا، ئەڵێ: "خوێنەر ئەبێ ورد بێتەوە لە ڕاگەیاندنی ئەو جۆرە هەڵوەستە، لە هەزار مەلا یەکێکی زات ناکا قۆڵی مدیر ناحییە بگرێت و بە دوای خۆیەوەی بدا، هەر نەبێ لە بەر ئەوەی کە ئەزانێ بۆی ناچێتە سەر، لەوە هەر بگەڕێ کە نان بڕانی تێدایە، کە مەلایش زات نەکات کەسی دیکە زات ناکات. ئەدی چۆن مەلای کۆیی موتەسەڕریفی دواخست و دواتریش قسەی بە مەلیك فەیسەڵ بڕیەوە؟"[١٧]

مامۆستا مەسعود محەمەد دوای خستنە ڕووی ئەم پرسیارە خۆی وردە وردە و دانە دانە هۆکاری ئەم چاونەترسییەی باس ئەکا: "لە بەر ئەم هۆیانە:

---

[16] ) سەرچاوەی پێشوو : ٢٣.

[17] ) سەرچاوەی پێشوو : ٢٣ .

١ــ خۆی لەسەر حەق دەزانیَ.
٢ــ بڕوای پتەوی بە خۆی و کەسایەتی خۆیەوە هەبووە، تا ئەوەی ڕەفتارەکە بە لایەوە وەك ئاو خواردنەوە وابوو.
٣ــ ترس و تەمای لە دلاّ نەبوو.
٤ــ بەخۆیدا ڕادەپەرموو زالْ بێت بەسەر هەر ئەنجامێکی لەو هەلْوەستانەدا بکەوێتەوە.
٥ــ شەرمی لە خۆی دەهاتەوە لە ئاست داخوازی هەلْکەوت خامۆش بێت.
٦ــ کەرەستەی هەموو هەلْوەستێك و هەلْکەوتێکی لەوانەی بێنە بەر هەنگاوی مرۆی وەك خۆیەوە بە زیادەوە هەبوو، هەر لە زمانی پاراو و تا ڕەوانبێژی تا زانستی سەردەم تا مێژووی گەلان تا دلْی هوشیار تا جورئەتی بێسنوور...
٧ــ بەگژ نارِەوایی دا دەچووەوە نەك ڕەوایی.
٨ــ مەلایەتی بەلای ئەوەوە ژوورووی هەموو پایەیێکەوە دەهات"[18].

٤ــسیفەتێکی تری مەلای گەورە کە تەواوکەری سێ سیفەتەکەی پێشووە، ئەوەیە کە لە مەلایەتی و بواری تایبەتی خۆیشیدا هەر بە جورئەت و زانا و شارەزا بووە، بۆ سەلماندنی ئەم قسەش دیسان گێڕانەوەکانی مەسعود محەمەد ئەکەینە بەلْگە، ئەو دەربارەی باوکی ئەلْێ: "باوکم مەلا بوو، بەلاّم مەلایەك کە بتوانیَ لە هەموو زانستەکانی ئیسلامدا کتێب دابنیَ، تەنانەت لە هەندیَ مەسەلەدا (ئیجتیهاد)ی خۆی بەکار دەهێنا. بە درێژایی عومری مەلایەتی خۆی

[18] ) گەشتی ژیانم : ٢٣ ـ ٢٤ .

دەرسی گوتبێتەوە یەكسەر بێ ئامادەكردن دەرسی گوتۆتەوە. دەمدیت كە دەكەوتە سەر شەرح و تەقریری دەرسەكان وەك تاڤگە قسەی لێ هەڵدەڕژان. ناوناوە لە گەرمەی تەقریردا هەڵوەستێكی دەكرد و چاوی دەبڕییە شتێكی نادیار دەیگوت لەو تەرزە حاڵەتەدا چەند ڕێبازێكی شەرح بۆم دەكرێنەوە. لەو هەڵوەستەدا یەكێكیان پەسەند دەكەم. واش دەبوو كە پێویست بە شەرح نەبووبێت بە چەند قسەو هێمایەك لە دەرسەكە دەبۆوە.

(( باوكم (**خطيب**) بوو، بەڵام (**خطيب**)ێك كە بتوانێ بە كوردی و عەرەبی و توركی و فارسی تا حەز بكات لەسەر بابەت بدوێ بێ حازركردن و بێ كاغەز و بێ ئەوەی پێشتر ئاگادار بووبێ لە چ دەدوێ"[19].

٥ـ ئەم باوەڕ بەخۆبوونە و لەڕوو ڕاوەستانەی بۆ دەسەڵاتداران وای نەكردبوو كە لە خۆباییبوون و دووره پەرێزی تێدا دروست بێت، بەڵكو بە پێچەوانەوە مەلای گەورە بەرامبەر كاسبكاران و ڕەنجبەران زۆر خاكی بوو و زۆریش ڕێزی لێ دەگرتن، چونكە خۆیشی جوتیار و ڕەنجبەر بوو، لە كێڵگەی خۆیدا لە چنارۆك كاری دەكرد، ئەو ڕێزی كاسبكارێكی ئەدا بەسەر دەیان شێخ و سۆفی درۆیینەدا.. مەسعود محەمەد لەم بارەشەوە ئاوا ئەڵێ: "...ئەو خۆی هەمیشە كاسبكار و ڕەنجبەر و ئەركدەری خاوێنی بەلاوە موحتەرەم بوو، سەدان جاریش لێم بیستووە ڕەنجبەرێكی چالاك هەزار سۆفی و فەقێ و دەروێشی عەمەل بەد دەهێنێ، یان كە دەیگوت نانێكی بە ئەركی شان پەیدا كرابێ سەد شەرەفی هەیە بەسەر سوود و دارایی ناڕەوادا"[20].

---

[19]) گەشتی ژیانم : ٢٥ .

[20]) گەشتی ژیانم : ٥٣ ـ ٥٤.

مەسعود **محەمەد** ئەوەمان بۆ باس دەکا کە جارێکیان خزمان لە مەلای گەورە کۆبووبوونەوە بۆ ئەوەی هانی بدەن بچێتە بەغدا و تەکلیف لە حکومەت و مەلیك بکا کە هەندێ یارمەتی بدەن، چونکە میوان و فەقێ و ڕێبواری زۆری لە دەورە و باری گوزەران و ئابووریشی زۆر باش نیە، باس ئەکا ئەڵێ: "باوکم لە وەڵامدا پێی گوتنەوە: **وا ـ وبـا ـ وتـا ـ**، کە بە نوکی دار عەساکەم ئاو ڕادەکێشم بۆ بن درەختێکی تینوو هەزار جار بەلامەوە بە شەرەفترە لەوەی لە بەردەرگەی مەلیك یان (**رئیس الوزراء**) داوای ڕوخسەتی چوونە ژوورەوە بکەم. دواتر بەدەم پێکەنینەوە ئەم بەیتەی خوێندەوە:

شـــاهی کـە نەبـێ ڕادەبوێرین بــە فـەقیری
بە ئەهلی قەناعەت لەپلاو خۆشترە داندووك"[21]

٦ــ قووڵبوونەوە و ڕامان لە گەردوون و ژیان: مامۆستا **محەمەدی** جەلی وەکو زاناکانی پێشینی ئەم ئوممەتە بووە، نەك هەر مەلایەك بووبێ و بەس، بەڵکو زۆر ژیر و بیرمەند و وردبین و بەئاگا بووە.. ئەو زۆر لە خەڵکی دەورو زەمانی خۆی جیا بووە و زۆریش پێشیان کەوتووە لە دەرککردنی ڕاستییەکاندا. مەسعود **محەمەد** ئەڵێ: "لە سییەکاندا شەوێکی هاوین، کە خەڵق هەموو لە سەربانان دەنووستن، دوای بەسەرچوونی دەمی دیوەخانە و داهاتنی کاتی خەوتن، لە نوێنەکەمدا هێشتا نەبۆرژابووم باوکم لەنێو تەخت و چیغی خۆیەوە بانگی مامی کرد (بانەکانمان بەسەر یەکەوە بوون و شوورەیان لە بەیندا نەبوو) گوتی: نوورەددین سەیری فلانە شوێنی ئاسمان بکە وا فلانە ئەستێرەی(سەیار) خەریکە

---

[21]) گەشتی ژیانم : ٥٤.

فلأنە ئەستێرە دادەپۆشێ. لەو عومرەی سێزدە_چواردە سالیمدا بە دلمدا هات کەوا ڕەنگە باوکم تاکە مرۆڤێك بێ لە هەموو کوردستانی عێراقدا سەرنجی بۆ دیمەنی ئاسمانی ئەوتۆیی بکێشێت و ئەستێرەکان بناسێتەوە بە وەستاو و گەڕۆکیانەوە"[22]. ئەم نموونەیە لەسەر ڕامانی ئەم کەڵەپیاوەیە لە گەردوون و سروشت، هەر بەدوای ئەم نموونەیەدا مەسعود محەمەد نموونەیەکی تری بیرکردنەوەی باوکیمان بۆ باس ئەکا کە ئەوە ئەسەلمێنێ کە مەلای گەورە لە ئاسماندا جێنەماوە، بەڵکو هەرچۆن لە ئاسمان ڕاماوە، هەرواش لە ئەحواڵی ڕۆژگار و وڵات و سەرزەویش تێفکریوە و پێشبینی داهاتوویشی کردووە بە پشت بەستن بە قووڵبوونەوە و بیرکردنەوەکانی ڕۆژانەی، ئەڵێ: "هەروەهاش لەبیرمە کە نەوتی بابەگوڕگوڕ کەوتە سەر باری ئیشی تەواو و ئاگرەکانی شەو و ڕۆژ بڵێسەو دووکەڵیان بەرز دەبۆوە باوکم تێبینی ئەوەی کرد کە ڕەنگە زۆر نەبات ئەو هەموو دووکەڵەی پڕ لە غازی هەمەجۆر بە هەوادا بڵاو دەبێتەوە کاری بەد لە دەغڵ و درەخت بکات و ژەنگیان پێ هەڵبێنێ، وابزانم حکومەتیش بیری لەم لایەنە نەکردبۆوە، دوای دەیان سالیش ئنجا حیکایەتی (پیس بوونی هەوا) کەوتە سەر زار و زمانی خوێندووەکان"[23].

دوای باسکردنی ئەم سیفەتانەی و پێش ئەوەی بچمە سەر لایەنێکی زۆر دیارو پەیوەندیداری بەم باسەی خۆمانەوە، حەز ئەکەم ئاماژەیەك بۆ کاریگەری مەلای گەورە بکەم لەسەر مەسعودی کوڕی، کەسێك کە مەسعود محەمەدی گەورە بیریار و فەیلەسوف و نووسەر نەناسێ، باسکردنی کاریگەری مەلای

[22] ) هەمان سەرچاوە : ٢٧ .

[23] ) هەمان سەرچاوە : ٢٧ .

گەورە لەسەر دەروون و کەسێتیشی هیچ سەیر نیە بە لایەوە و ڕایناچەڵەکێنێ و سەرنجیشی ڕاناکێشێ.

مەسعود محەممەد بەو دەیان کتێبە قـووڵ و گرنگانـەی کـە نووسـیونی و بـەو سەرنج و تێبینیانەی لە بواری ئەدەب و زمانی کوردیدا خستوویەتیەڕوو و بـەو زماتە پاراو و شیرینەی پێی ئەنووسێ هەمـوو خوێنەرانی خۆی سەرسام کردووە، تەنانەت (صدام حسێن)ی سەرۆك کۆماری پێـشووی عێـراق چـەندین جـار دوای پەخش بـوونی بەرنامەیـەکی تلفزیـۆنی یـان نووسـینی بابـەتێکی ڕۆژنامـەوانی پەیوەندی پێوە کردووە لەڕێگەی سکرتێرەکانیەوە و سەرسامی خۆی بۆ دەربڕیوە و ئامادەییشی دەربڕیوە کە چی بوێ بـۆی ئەنجامـدا و پێـی ببەخـشێ، ئـەمیش تـــەنیا سوپاســـی دەربڕیـــوە و داوای هیـــچی نـــەکردووە، جـــارێکیش دوای چـاوپێکەوتنێکی تلفزیـۆنی لـە ئـابی ١٩٨٤دا کـە تێیـدا گلـەیی بـە چـاپ نەگەیاندنی کتێبەکانی کردبوو، سەرۆك کۆماری تیاچووی عێراق فەرمانی دابوو کە چۆنی ئەوێ ئاوا کتێبەکانی بۆ چاپ بکەن.

مەسعود محەمەد بیرمەندێك کە بتوانێ دەیان لاپەڕە لە بارەی دیوارێکی وەك هێلکە سپییەوە بنووسێ و چەندین واتا بۆ دێڕێکی نالی بدۆزێتەوە کە بە بـیری مامۆستا و زانا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕەکانیشیدا نـەهاتبێ و(هـێمن)ی شاعیر بڵێ: نالی ناسترینمان مەسعود محەمەد بوو و کەس لە حزوری ئەودا باسی نالی نەئەکردو، (هەژار)ی ئەدیب و شاعیر و وەرگێڕ و زمانزان لە بارەیەوە بڵێ: " لە هەمـوو کوردستاندا و لە هەمـوو جیهاندا کەس وەك مەسـعود نانووسـێ، کەسێك قەڵەمی ئەوی نیە، ئەو کوردییەی ئەو دەینووسێ لە توانای کەسدا نییە

"[٢٤]. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەحمەدی قازی نووسەری کوردی ڕۆژهەڵاتی لە مەڕ هەژارەوە دەڵێ: " من لە نزیکەوە هەژار دەناسم، هەرگیز لە خۆوە تەعریفی لە کەس نەدەکرد "[٢٥].

ئەوێك بە (عەققاد) و (هیگڵ)ی کورد باس بکرێ بە قسەی هەندێ نووسەر و ڕۆشنبیر و کەسێك کە بە قسەی خۆی هەرگیز لەژێر کاریگەری کەسدا نەبووبێ و سێبەری کەسی پێ مەزن نەبوونێ. پیاوێك (خەسرەو جاف) لە بارەیەوە بڵێ: " ئەوانەی لە دەرەوە خەڵاتی نۆبڵ وەردەگرن بە بڕوای من لە مەسعود محەمەد زیاتریان پێ نیە "[٢٦]. بیرمەندێك (فەرهاد پیربال) لە وەسفیدا بڵێ: "مەسعود محەمەد تاقانە فەیلەسووفی کوردە"[٢٧]. هەروەك **(جلال ا نفي)** بە فەیلەسووفی ناوبردووە. ئەم پیاوە ترسناکە(!) کە حەوت دانە ساڵ لە خەڵوەت و بیرکردنەوەدا بووە و بیری لە بچوکترین شتی دەوروبەریشی کردووەتەوە، کەچی کاتێك باسی باوکی ئەکات بە ئاشکرا مرۆڤێکی ترە و ئەگەر ڕەوابێ بڵێم، هەر منداڵەکەی کۆشی بابەیە! ( **يد ا طبعي**)ی نووسەر، کە گرنگییەکی تایبەتی داوە بە ژیان و فکری مەسعود محەمەد، لەبارەی کاریگەری کەسایەتی مەلای گەورە لەسەر بیر و کەسێتی مەسعود محەمەد ئەڵێ: " لەژێر کاریگەرییەکی زۆری باوکیدا بووە،

---

[24]) مەسعود محەمەد ژیاننامەو ڕۆڵی لە بزوتنەوەی ڕۆشنبیری کوردی دا، لوقمان محمد قادر. دەستنوس.

[25]) هەمان سەرچاوە .

[26]) هەمان سەرچاوە .

[27]) هەمان سەرچاوە .

بێگومـان پـێ کاریگـەربوونێکی رووحـانی بـووە "[٢٨]، هـەر ئـەو ئامـاژە بـە سەیرترین شت ئەکات لـە حـوکمی (**متنافضات**) دژ یەکەکانـدا، کـە کاریگـەری باوکی لە ڕوویەکەوە وەك گلۆپێکی درەوشاوە بووە بۆی بۆ ئەوەی باوەڕ بە حەق بێنێ و دەستی پێوە بگرێ و دوور بێ لە درۆ. لەلایەکی تـرەوە و لـە ڕوویـەکی بەرامبـەرەوە کەسـێتی مـەلای گـەورە بـەو بلیمـەتی و شـارەزایی و زمـان پاراوییەیەوە کە هەموو ئاستەکانی تێپەڕاندبوو کاری کردبووە سەر کەسێتی و ئازایـەتی ئـەدەبی مەسـعود محەمـەد و کپـی کردبـوو، بـە مـەرجێك هـەر لـە منداڵییەوە مەسعود توانای زۆری تێدا بوو، بە قسەی (**ا طبعي**) ئەم کپکردنە و ترساندنە هەرچەند لە ژیانی مەسعوددا لە چاوان ونبووە و دیار نەماوە، بـەڵام لەناو نەچووە.

مەسعود محەمەد خۆی لەم بارەیەوە ئەڵێ: "باوکم تاکە مرۆڤێکە تەئسیری بێ سنوری لێم کردبێ، ئەو تەئسیرە لە زۆر ڕووەوە بوو، بەڵام من تەنها باسـی دوو ڕووی دەکەم کەوا زۆر بەسـەیری پێـچەوانەی یـەکترن: ڕووی یەکـەم ئەوەیـە کـە حەقپەرستی و ڕاستگۆیی و ڕاسترەوی ئەو لە مندا مـاکی تەقدیـسی (ڕاسـتی)ی رسکاند، ئەو تەقدیسەش کێشایەوە سەر هەندێ کە تا ڕادەی قێزهاتنەوە سڵ لە درۆزن و درۆ بکەمەوە، بەتایبەتی لە مەیدانی کۆمەڵایەتیـدا. ڕەنگـە عـوزری کەسێك قبووڵ بکەم لەو درۆیەی دەیکات لە مامەڵەتی بەیع و بـازاڕدا، بـەڵام یەکێك لە بیروڕا و فەلسەفە و ڕامیاری و شتی گشتیدا درۆ لەگەڵ میللەتەکەی بکات تاوانبـارترە لـە پیـاوکوژ و ڕێگـر و دەسـتبڕ، درۆ کـردن لەگـەڵ میللەتـدا

---

[28] ) **مسعود مد ، يدا طبعي .**

بەلامەوە خیانەتی بێ تەئویلە.

ڕووی دووەم: ئەوەیە کە شەخسییەتی زێدە بەهێزی باوکم لە مندا وردە وردە هەستی لەخۆڕازی بوون و بەخۆدا راپەرموونی کز کردووە، ساڵ لە دوای ساڵ بە شێوەیەکی ئاشکراتر بۆم ڕوون دەبۆوە کە من هەرچی هەبم ناگەم بەو باوکە. ڕاستییەکەی بە حاڵ لە دەست هەستی (خۆ بەکەمزانین) ڕزگار بووم. هەمیشە لەگەڵ خۆمدا دەمگوت: من هەر جورئەتێکی لە پێویستدا بنوێنم ناگا بەو جورئەتەی لە هەمان پێویستدا باوکم دەینواند، تا گەیشتم بە پلەیەك کە ترسم لێ بنیشێ لە خۆدەرخستن و لە هەڵوەستەدا ڕاوەستان چونکە کەمە کەمە ترسی (ناگەم بەو) لێم دەبوو بە(ناوێرم وەك ئەو).

هەر لە بیرمە لەگەڵ بیرکردنەوەش شەرم دامدەگرێ: هاوینی ١٩٤٦ کە کۆی کزبوونەوەی کوردایەتی بوو عەبدولئیلاه لە هەولێر ئاهەنگێکی شاهەنشایانەی بۆ گێڕدرا و لە ئاهەنگدا بە گوتار و بە شعر لە لایەن هەلپەرستانەوە بۆ ئاسمان بردرا، هەمووشی لەسەر حیسابی کوردایەتی. لەو دەمەدا ڕازی بووم بە نرخی نیوەی عومرم بوێرم هەڵستم و لغاوێك بخەمە زاری ئەو هەموو پێداهەڵگوتنە و شاباش و چاوشییەوە. بەڵێ جورئەتم نەکرد، بەلام بێگومان هۆیەکی گەورەی جورئەت نەکردنەکەم بریتی بوو لەوەی کە لەگەڵ خۆمدا دەمگوت: ئەگەر باوکم بەرحەیات بوایە ئەو کەسانە نەیاندەوێرا وەها بە ڕاشکاوی لەسەر حیسابی شەرەفی کوردایەتی حەیا و شەرمی وڵاتەکەیان بۆ سەر پێڵاوی **(وص ـ ي)** هەڵباوێن"**[29]**.

---

[29] ) هەمان سەرچاوە : ٢٧ ـ ٢٨ .

"بەر لەوەی خۆم بیدرکێنم کەس نەیدەزانی و گومانی بۆ ئەوە نەچووە کە چ جۆرە شەرِی ناوەکی و دەروونیم کردووە بۆ رِەها بوون لە چنگاڵی ئەو هەستەی خۆ بە بێدەسەلأت زانین لەتەك دەسەلأتی بێسنووری باوکمدا"[30].

ئـەبێ مـەلای گـەورە چ گـەورە و مـەزن بووبـێ کـە مەسـعود محەمـەدی وا ترساندبێ ؟!!

٧ــ سـیفەتێکی تـری مـەلای گـەورە کـە مـن وەك دوا سـیفەت باسـی ئەکـەم و پەیوەندیشی بە نامیلکـەی (فـرِی فـرِی قـەل فـرِێ)یـەوە هەیـە ئەوەیـە کـە زۆر عـەقلأنی بووە و بە گژاچوونێکی زۆر زەق و ئاشکرای هـەبووە لەتـەك سـۆفی و دەروێش و بەناو شێخەکاندا، ئەو باوەرِی تەواوی بە عـەقلّ هەبوو، هەموو کار و رِەفتار و گوفتارەکانی دەروێشان و تەڵەکەبازە خۆ بەشێخ زانەکانی بە گەمژەیی و بێ عـەقڵی و خورافییات دەزانی، ئەو زۆر رِێزی بۆ شێخان و پیاوچـاکانی وەك مەولانا خالدی نەقـشبەندی و کـاك ئەحمـەدی شـێخ و شـێخ **ضـیاء** الـدین ی نەقشبەندی هەبوو، پەیوەندیشی لەگەڵ چەندین شێخی بۆ خوا سولّحاوی زەمانی خۆیدا هەبووە، بەڵام دژایەتی کەس پەرسی و نـەفامی و حـەیاحوی زۆرێـك لـە قۆڵبرِ و درۆزن و دەجالەکانی دەکرد و هەموو جۆرە هاوار و هانا بردنێکـی بـۆ جگە لە خوا بە شیرك و کوفر دەزانی، لـە نامیلکـەی **(ستة أشخاص)**دا ئـەڵێ: "جگە لە خوا پەنا بە کەسی تر مەگرن لە کار و گوزەرانتاندا، پەناگرتنیش بـە زمان نییە، بەڵکو بە کۆشش و کار و توانا و هێز خستنە ئیشە و بە پتەو کردن و بەکارخـستنی هـەموو هۆکارەکانــە بــۆ چارەســەری نەخۆشــییەکانی دڵ و

---

[30] ) هەمان سەرچاوە .

تورهەڵدانی پیساییەکان و خەوشێکانە لە بیروباوەڕدا، وەك ئەوەی هیچ وەلی و پێغەمبەرێك نەکەین بە هاوبەش و شەریك بۆی و کەسمان کەسی ترمان بە خوا سەیر نەکەین".

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەی مەلای گەورەش لەوەوە دێ، کە جگە لە زیرەکی و ژیری خۆی، کەوتبووە ژێر کاریگەری قوتابخانەی جەمالەددینی ئەفغانی و محەممەد عەبدەی قوتابییەوە. لە پێشەکی روونکردنەوەی کتێبی (سەرگوزشتەکانی ژیان)ی م.محەممەدی خاڵدا ئاوا هاتووە: " پاش غەفڵەتێکی درێژخایەنی جیهانی ئیسلامیی، کە مسوڵمانان بێئاگاییەکی ترسناك روویتێکردبوون و شارەزاییان لە ئایینەکەیان کاڵببووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خورافەیەکی زۆر بڵاوببوەوە، دەوڵەتی عوسمانی بەرەو کزی و لاوازی دەچوو، وڵاتانی ئیستعماریش هەر ماوەیەك پارچەیەکیان لێدادەبڕی، لەم حاڵەتە شپرزەدا سێ رەوتی نوێکردنەوەو بەئاگاهێنانەوە سەریانهەڵدا:

١ -رەوتی سەلەفییەت لە حیجازەوە بە پێشەوایەتی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب.

٢ -رەوتی ریفۆرمخوازان لە ئەفغانستان و هیندستانەوە بە پێشەوایەتی جەمالەدینی ئەفغانی.

٣ -رەوتی بانگەوازو رێکخستن لە میسرەوە بە پێشەوایەتی حەسەن بەننا.

ئەم سێ رەوتە وردە وردە بوون بە سێ قوتابخانەو بەرەو وڵاتانی دیکەی ئیسلامی کشان، زۆر لە وڵاتە ئیسلامییەکان پێیانەوە کاریگەر بوون، کوردستانی ئێمەیش نەبوێررا لەو کاریگەربوونە، با بە رێژەیەکی کەمتر لە وڵاتانی دیکەش بووبێت.

لەو زانایانەی کاریگەریەیی رەوتی دووەمیان کەوتە سەرو بوون بە بەشێکی قوتابخانــەی ریفۆرخــوازیی لــە کوردســتاندا دوو مامۆســتای بــیر روونــاك و هەڵکەوتوو بوون:

یەکەمیان: مامۆستا مەلا موحەممەدی جەلیزادەی کۆیـە (مـەلای گـەورە)، کـە مەسعود موحەممەد لەچەند شوێنێکی نووسینەکانیدا باسـی کاریگەربوونەکـەی دەکات و مەلای گەورە بە شوێنکەوتەی ئەو قوتابخانەیە دادەنێت.

دووهەمیان: مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ بوو رەحمەتی خوایان لێبێت "[31].

ئـەم دوو زانایــە زۆر جـەختیان لەســەر راسـتکردنەوەی چـەمکە هەڵـەکان دەکردو، هەوڵی فاماندن و تێگەیاندنی خەڵکیان ئەدا بەهەمـوو شێوەیەك.. بۆیە " لەپێــشاندانی رووی راســتی ئیــسلام و بەگژاچــوونەوەی خورافــات کــە لــەو سەردەمەدا ولاتی تەنیبوو، مەلای گەورە (فـرِێ فـرِێ قـەل فـرِێ) دەنووسـێت و شێخی خالێش (مەولودنامەی نەوئەسەر) ، هۆی ئەم نووسینەش وەك شێخ خۆی ئەلێت: لە جیاتی هەندێ لە نامیلکەی تر لە خەرافیات خالێبوو..".

لە (فرِێ فرِێ قەل فرِێ)یشدا زۆر بە ئاشکرا دیارە کە مەلای گەورە زیاتر بیری لای دونیای موسولْمانان بووە و باش زانیویـەتی کـە شـوێنکەوتنی کـەرامات و خورافات مالْی موسولْمانان کاول ئەکا و قیامەتیشیان هەر هـیچ.. تاکـە داوای مەلای گەورە لە شێخ پەرستەکان ئەوەیە بگەڕێنەوە دۆخی مندالْی و هـەر وەك ساوایەك بیر بکەنەوە، ئەوجا بزان زۆربەی کار و قسەکانی گـەورەیی ـئێـستاـ بە پڕوپووچ و بـێ بـەها و شـێتی دەرناکـەوێ؟ مامۆسـتا محەمـەدی جـەلی لـەم

---

[31] ) سەرگوزشتەکانی ژیان ، مامۆستا موحەممەدی خاڵ .

نامیلکە بچووکەدا زۆر بنەمای جوان ڕوون ئەکاتەوە و زۆرێك لە ریوایەتە ئیسرائیلی و هەڵبەستراوەکانی ناو عەقاید و تەفسیر رەت ئەکاتەوە و ناڕاستییان ئەخاتە ڕوو.

ئەگەر سەرنجێکی نووسراوەکانی مەلای گەورە و ژیانی ڕۆژانەشی بدەین ئەبینین هەمیشە و بەردەوام دژایەتی خورافیات و چاوبەسکردنی کردووە بەناوی خوا و شێخایەتییەوە، لە هەموو کتێبەکانیدا ئەگەر بە یەك دێڕیش بێت بەرپەرچی ئەم بیروباوەڕە ناڕاستەی داوەتەوە.

زۆری ڕق لە گەوجی و ناعەقڵانی بوون بووە، وەك لە (فڕی فڕی قەل فڕی)دا دەرئەکەوێ پشتی بە فیترەت و سروشتی پاکی منداڵان بەستووە بۆ بە درۆخستنەوەی خورافیات و شتانی نامەعقول، مەسعود محەمەد ئەڵێ: "وەها بووە لە مەجلیسی خۆی، کە جارێ تەمەنم ٤_٥ ساڵی بووە، قسەی مەیلەو کامڵانەی لێ گێڕاومەتەوە لەسەرشکێن کردنی ئەو کەسانەی بە خورافات هەڵدەخەڵەتێن قسەیەکی منی باس کردبوو بۆ ئاپۆڕەی گوێگرانی وەعزی ئێوارەیەك لە ئێوارانی ڕەمەزانی ئەو تەمەنەم، گوێ بیست بووبووم، گۆیا کەری دەجاڵ جێگەی حەفتا هەزار جوولەکەی لە سێبەری یەك گوێچکەیدا دەبێتەوە، منیش گوتبووم: کۆڵانەی کۆیێ تەسکن، ئەو کەرەیان پێدا نایەت لێی مەترسن، باوکیشم قسەکەی لە وەعزدا کردبوو بە شایەد بۆ زێدە گومڕایی و گەمژەڵیی کەسێکی درۆیەك بسەلمێنێ کە هۆشی ساوایەك پێی ڕازی نەبێ"[32].

بچوکترین دەرفەتی بۆ دەرخستنی ئەم دژایەتیە لە دەست نەداوە و هەر

---

[32] ) گەشتی ژیانم : ٦٩ ـ ٧٠.

جێیــەك لوابــێ بــۆ دەربرِینــی رِاوبۆچــوونی خــۆی لەمــەرِ ئــەم مەســەلەیە و بەرپەرچدانەوەی خورافیاتی شێخ پەرستان بەکاری هێناوە و قۆستوویەتیەوە، لـە تەفسیری ئایەتی (١٦٥)ی سوورەتی (البقرة)دا: ﴿**ومن الناس من يتخـذُ مـن دون ا ـ أنداداً يحبونهم كحُب ا ...**﴾ ئـەڵێ: "تەماشـاکەن زیـادەرِەوی لـە خۆشویستنی شێخانی تەریقەت چۆن دروس بووە و هاتووەتە گـۆرِێ بـە قـسە و تورِەهــاتی دەروێــش و ســۆفییەکان و بــە حیکایــەتی مــەلا بــێ ئاگاکــان و چیرۆکەکانیان، بە جۆرێك شێخانیان لێ کردووین بە خوا و ئەیانپەرستن، بـەڵکو خوا هەر ناناسن مەگەر تەنیا وەك ئامراز و وەسیتێك کـە ئـیرادەی شـێخ بـەجێ بێنێ و کارەکانی جەنابی ئەو رِاپەرِێنێ و باوەرِیشیان وایە کە ئەم بیروباوەرِانەیان حەقێکە کە ناکرێ لێی لادەی"[٣٣]! إن شاء ا لە بـەراوردی نێـوان (فـرِێ فـرِێ قەل فرِێ) و کتێبی (دایە و باوە! کێ خراوە)ی د.شـەریعەتی دا زیـاتر قـسە لـە ناوەرِۆکی نامیلکەکەی بەردەستمان ئەکەم.

شێخی خاڵ نوکتەیەکی خۆش لە بارەی مەلای گەورەو دەروێشێکی خۆ بـە عارفزان ئەگێرِێتەوەو ئەڵێ: "خوالێخۆشبوو مەلا موحەممەدی کۆیە زۆر رقی لە دەروێش و سـۆفی و شـێخەکانیان بـوو، رۆژێـك دەروێـشێك ئەچـێتە لای، مـەلا موحەممەدیش بەخێرهاتنی ئەکات و پێی ئەڵێت: ماڵت لـە کوێیـە؟ دەروێـشیش ئــەڵێت: قوربــان مــاڵی دونیــاییم ئەفــەرمووی یــا مــاڵی قیامــەتیم؟! مــەلا موحەممەدیش ئەڵێ: کەرە! ماڵی قیامەتیت بێ گومـان جەهەننەمـە، پرسـیارت لێ ئەکەم لە چ دێیەك دادەنیشی؟"[٣٤].

---

[33] ) برِوانە : محمدبن عبدالله الجلی : ٢٠٢ .

[34] ) سەرگوزەشتەکانی ژیان .

مەلای گەورە زۆر توڕەیە لەوەی کە ئاپۆڕەی خەڵقی نەفام گوێ لە زانا و شەرعزانەکان ناگرن، کەچی ئەبنە ئەڵقە لەگوێی بەناو وەلی و بەدرۆ شێخەکان، ئەگەرچی قول لە فول جیا ناکەنەوە.. لە پەرتووکی (**مسألة الإختيار**)دا ئەڵێ:

"...ئەبینی زۆربەی کوردان گوێ نادەنە زانایەکی کارپێکەری قورئانی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی، ئەگەرچی هەموو ئایەتەکانی خوایان بەسەردا بخوێنێتەوە و هەرچی بەڵگەش هەیە بۆیانی بهێنێتەوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو گومڕاییەی لەسەرین، بەڵام ئەو کەسەی کە بە باوەڕی خۆیان بە وەلی خوای ئەزانن قسەیەکیان بۆ باس بکات کە زیانی دین و دنیایانی تێدایە و بۆ هەرکەس کەمترینی هەست و شعوری هەبێ پووچییەکەی دیار و ئاشکار ئەبێ.. ئەوان هەر قبووڵی ئەکەن و بە بەدیهی و یەقینی وەرئەگرن، هەر ئەمەش تاقە هۆکاری مردن و لەناوچوونی سەراسەریانە، بۆیە بە بێدار دێنە بەر چاوت لە حاڵێکدا_کە ڕاستییەکەی_ مردوون"[35].

ئەم زانا بەڕێز و پایە بەرزە _وەك باسم کرد_ بەشێکی زۆری شیعرەکانیشی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە و هێرشی زۆری کردووەتە سەر ئەو فێڵبازانەی بەناوی خوا و دین و شێخایەتییەوە ڕێ لە خەڵکی دەگۆڕن و چاوبەسیان ئەکەن، ئەوەندە لێیان تووڕەیە کە نەفرینیان لێ ئەکا و ئەڵێ:

مـن یـەخـەی خـۆم بـۆیـە دادەدڕم
ئێوە نـابن بـەهـیچ و مـن دەمـرم

[35] ) محمد بن عبدالله الجلى : ١٤٩.

ئـەوەی ڕێگـای لە کوردەکان گـۆڕی

لـەعنەتی خـوا لە ئەلـحەد و گـۆڕی

لە شوێنێکی تر ڕەخنە لەو مەلایانە ئەگرێ کە نەفامانە لەجیاتی باسکردنی شتی گرنگ و بەسوود بۆ دین و دنیای خەڵك ئەچن خۆیان خەریکی پیاهەڵدانی شێخان ئەکەن و ڕووپاماییان بۆ ئەکەن:

لە باتـی باسی دیـن و ڕوکنی ئیمـان

مەلا بـۆیان ئەخوێنـێ مەدحی شێخان

مەلا تـۆ باسی خـوایان بـۆ بفـەرمـوو

وەهـا باشـە لـە بـۆ وان و لــە بـۆ تـو

هـەر ئـەو مـەلا نەفامانـە و ئـەو تـەرزە بـیر و قـسە پووچـانە بـە هۆکـاری دواکەوتنی میللەت ئەزانێ و ئەڵێ:

*ئـەی مەلای نـەفام ئەتـو بـی و خـودا*

*لەبۆچـی ڕێگات لە کوردان تێـك دا؟*

ئەمە لەبارەی ئەو مەلایانەوە کە دۆستی شێخانن و قسەکانیان بەدرۆ نازانن، بەڵام لەبارەی خودی بەناو شێخەکانەوە، ئەوە زۆر بە توندتر ئەنووسێ و ئەڵێ:

بە ڕیشی پان و پـرچی پڕ لە ئـەسپێ

بنـاغـەی ئیشی کـوردان چـۆن دەچەسپێ؟

هەتـا شێخـێ لـە کوردستـان بمێـنێ

ئـومـێدی زیـندگـانیـت پێ نەمـێنـێ!

مەلای گـەورە هەنـدێ جـار تووڕەییـەکانی خـۆی لـە ڕاسـت فێڵبـازانی دیـن تێکدەردا بە شێوەی نوکتە و گاڵتـە دەربڕیـوە، ئـەبینین لـە جێیەکـدا بـەراوردی

سـەمای نـاو ئەلقـەی زیکـری دەروێـشان و سـەمای سـەماگە و بەڕەڵاخانـەکان بەیەکدی ئـەکا و تێکـەڵبوونی ژن و پیـاوان لـە زیکـر و حاڵـدا ئەشـوبهێنێ بـە تێکەڵاوی ئیباحیەکان و ئەم کـارەش بـە دژی کتێبـی خـوا و شـەرعی ئیـسلام و عیلمی دنیایی دادەنێ، ئەڵێ:

هەمـوو مەمنوونی شێخ عبـد الکریـمین
کــە سـڕی ئـەم تەریـقەی ئاشـکرا کـرد
لـە مەسـرەح خـانـەی بـەزمی مریـدان
بەگوێـرەی عـەسری خـۆی دانسی پەیاکرد
نەزۆکێ گەر بە ئیخلاص ڕوو لەوێ کا
دەبینـی شێـخ کوڕێکی پـێ عـەتـا کـرد
ڕەواجـی دا بـە دەسـتووری ئیـبـاحـی
کتـاب و شەرع و عیلـمی بێ بەها کـرد

ئەو شێخ عەبدولکەریمە: یەکێ بووە لە شێخانی بزووتنەوەی (حەقە).
ئەم بەدرۆ خەڵەتانەی گەلی کورد زۆر ئـازاری دەروونـی مـەلای گـەورەی داوە و خەمیان پێداوە:

هەتـا دەمـرم لە بۆ کوردان دەناڵم
عیلاجیـان چۆن بـکەم هـاوار بـە ماڵم
فـەقـیر و جـاهیـل و نـەخوێـندەوارن
لە لای نەوعی بەشەر بێ قەدر و خوارن

یەکێك لەو شتانەی مەلای گەورە زۆر دژی وەستاوە لە بیروبـاوەڕە هەڵـەکان: بیرۆکەی مەهدی و بەتەمای ئەو دانیشتن و چاوەڕوانکردنی عیـسا و تۆقـان لـە

دەجالـە، ئـەم مەسـەلانە لـە ڕاسـتیدا سـەپاوە و فەرموودەگـەلێکی سـەحیحی لەسەرە، بەڵام ئەوەندە درۆ و ئەفسانەیان بۆ زیـاد کـراوە کـە حەقیقەتەکەشـیان کەوتووەتە ژێر گومان و پرسیارەوە.. مەلای گەورە ــبە گوێرەی قسەکانیــ نەك دژی ئەفسانە بۆ زیادکراوەکانی ئەم بیروباوەڕانەیە و بەس، بـەڵکو دژی خـودی قەناعـەتەکەیە، لە(فڕی فڕی قـەل فـڕی)دا هەنـدێ گالّتـەی بـە خورافیاتـەکانی چیرۆکی دەجال کردووە، ئەو باوەڕی بەوەیە هـەر سـەردەمێك دەجـال و درۆزنـی خۆی هەیە و دەجالی ئاخرزەمانیش هەر یەکێکە وەك ئەمەکان، بە هەندێ عیلم و فێڵی زۆرتر و سەیرترەوە، بـەڕای مـەلای گـەورە ئـەو تەڵەکەبازانـەی بـەناوی دینـەوە خـەڵکی زۆج وگـەوج ئەکـەن جۆرێـك دەجالییـان تێدایـە و بـە دەجـال دەژمێررێن، لەم بارەوە ئەڵێ:

عـیسا لە ئاسـمان، مەهـدی لەناو بیر
ئـیـشمان شـلۆقـە یـاران چ تـەدبیـر
نە ئەو دێـتە خوار، نە ئـەم دێتـە دەر
دەجـالیش زۆرن گشـتی سـواری کــەر
لە دێ و لە شاری سەربەست دەگەڕێـن
بــە نـاوی دیـنـی بــاش دەلــەوەڕێـن
ڕیش پان و درێژ، مل قەوی و شان کوم
دوور بـن لە دینی وەك حایـە و ناحـوم[٣٦]

(حایە) و (ناحوم) دوو جوولەکەی شاری کۆیە بوون.

---

[36] ) هەموو ئەم شیعرانەم لە کتێبی (محمد بن عبدالله الجلی) لەنووسینی د.جواد فقی علـی وەرگرتووە، کە ئەویش لە دیوانی (دیاری مەلا محەممەدی کۆیی)ی وەریگرتووە.

## بەراوردێکی کورت و خێرا لە نێوان (فڕی فڕی قەل فڕی)ی مەلای گەورە و (دایە! باوە! کێ خراوە؟)ی د. عەلی شەریعەتیدا:

هەرکەس ئەو دوو نوسراوەی بینیبێ زوو پەی بەچەند خالێکی هاوبەش ئەبا لە نێوانیاندا، یان هەست بەوە ئەکا کە ئەم دوو نووسینە بەسەر یەك هێلدا ئەڕۆن و بۆ یەك ئامانج تیر ئەهاوێن، ئەگەر گرنگی (**دایە! باوە! کێ خراوە؟**) لەوەدایە کە زۆرترو درێژترە و نزیکەی ١٣٨ لاپەڕەیە و لەچاو (فڕی فڕی قەل فڕی)دا کە ١١ لاپەڕەیە تێر و تەسەل ترە، ئەوە گرنگی (فڕی فڕی) لەوەدایە کە لە زەمەنێکی زووتر و کۆنتردا نووسراوە و ئەوەی پێشتر هەنگاو هەڵبڕێ و پێ هەڵبڕێ کارەکەی هەرچەند کەمتر بێ بەنرخترە.. خالێکی لەوە گرنگتریش ئەوەیە: شەریعەتی بە چاکەت و بۆینباخێکەوە و دوای گەڕانەوە لە زانکۆکانی فەڕەنسا هاتووەتەوە و نەقدی بیری خورافی و دواکەوتووی ناو کتێبە ئایینییەکانی کردووە و ڕەخنەی لە ناماقوڵیەکانیان گرتووە، بەڵام مەلای گەورە هەر لەناوجەرگەی حوجرەکانەوە و بە مێزەر و جوبەی مەلایانەی خۆیەوە و لەژێر سێبەری منارە و گومەزی مزگەوتەوە کاری ڕەخنەگرانەی دەست پێکردووە و قەڵەمی تێدا وەشاندووە، قسەکانی د.شەریعەتی ــ بە هەموو جوانی و بەهێزییەکانییەوە ــ ئەگەری ئەوەی لێ ئەکرێ کە زۆریان وەرگیراوی قسەی کەسانی تر و هەڵێنجراوی بیری بیرمەندانی ڕۆژاوا بن و ئەم بە جورئەتەوە لە یەك جێدا بە زمانێکی پاراو نووسیبێتینیەوە، بەڵام ئەوانەی مەلای گەورە لە

تێڕامانی خۆی زیاتر و لە بەرهەمی عەقڵ و ئاوەزی زێدە مەزنی خۆی بەولاوە ئەگەری هیچی تری لێ ناکرێ، ئەمەش شتێکی کەم نییە بۆ کەسێك کە لێی بفکرێ.

خالێکی تریش کە دیسان تای تەرازووەکە بەلای مەلای گەورەدا قورس ئەکا: ئەوەیە کە د.عەلی شەریعەتی لە شەستەکانی گەورە شارێکی وەك تاران و کۆنە ولاتێکی وەك ئێرانی مێژوو دێرین دەستی داوەتە ڕەخنەگرتن و هەڵسەنگاندن، کەچی مەلای گەورە لە بیستەکانی نیوچە شارۆچکەیەکی بێ نەوای وەك کۆیە و لە ولاتێکی داگیرکراو و دابەشکراوی وەك کوردستانی عێراقدا نەشتەری خۆی خستووەتە سەر دیاردەی چاوبەسکردن و قۆڵبڕینی بەناو کەرامەت و شێخ دۆستی.. کەوابێ لەڕووی زەمەن و شوێنەوە یا لەڕووی مێژوو و جوگرافیاوە هەر کارەکەی مەلای گەورە زیاتر جێگەی ستایشە و زۆرتر جێی ئافەرین کردنە.

من لەبەر ئەوەی نامەوێ زۆر درێژی کەمەوە بۆیە بە کورتی هەندێ خاڵی هاوبەش و وێکچوو لە نێوان ئەو دوو پەرتووکەدا بە نموونەوە ئەخەمە ڕوو:-

١_ لە ڕەخنەگرتنیاندا هەم مەلای گەورە و هەم شەریعەتی پشت بە عەقڵ ئەبەستن، بە بەڵگەی ژیریی و لێکدانەوەی عەقڵی کەم و کورتی و خورافی بوونی شەخس پەرستەکان ئەخەنە ڕوو و ئەیسەلمێنن.

مەلای گەورە لە وەڵامی ئەوانەدا کە باوەڕیان بە فڕینی شێخ هەیە لەبەر ئەوەی خۆشەویستی خوایە، ئەڵێ: "برام لازم نیە ئەوی خۆشەویستی خودا بێ بفڕێ، فڕین قاعیدەی هەیە، پێغەمبەر، ئەبوبکر، عومەر، عوسمان، عەلی خۆشەویستی خودا بوون و نەفڕین، بەڵام چوێلەکە دەفڕێ و خۆشەویستی خوداش نیە"! ئەمە وەڵامێکی عەقڵیە و بەپێی یاساکانی بوونەوەر داڕێژراوە.

لە دوادوایی نامیلکەکەیشیدا ئەڵێ: " بەڵێ ئەگەر ئەمڕۆ بڵێین عەقڵ لە نێو موسوڵمانان فڕی: ڕاستە.. گورج دەست هەڵبڕە، وە ئەگەر بڵێین علم و زانین لە نێو کوردان فڕی: وایە، خێرا دەست هەڵێنە، هیچ ڕامەوەستە.. نە علم، نە عەقڵ، نە فکری تەنقید ـــ ڕەخنەگرتن ـــ و موحاکەمە ـــ دادگایی کردن ـــ لەناو موسوڵمانان خوسوسەن لەناو کوردان، ئەوانی تابیعی شێخانن نەمایە، فڕییە، ڕۆیشتییە ".

(د.شەریعەتی)ش لە جێیەکدا ئاوا ئەڵێ: " هەرکەس تۆزێك بە ژیری بیر بکاتەوە و سەرووبەری ئەم گفتانە لێك داتەوە، زوو تێ دەگا کە دین دوژمنانی ئێمە لە درێژایی مێژووی موسوڵمانەتیدا، چەند خەریك بوون دینەکەمان لێ تێك دەن و قورئانمان لەبیر بەرنەوە "[37]. بە ئاشکرا ئەبینی هەردوکیان جەخت لەسەر بیرکردنەوەی ژیرانە و وردبوونەوەی عاقڵانە ئەکەنەوە.

٢ـــ خاڵێکی زۆر وێکچوو لە نێوان هەردوو کتێبەکەدا ئەوەیە: کە ئەرکی موسوڵمانانە بە گژی داگیرکەردا بچن و دەست بۆ هۆکار و ئامرازە زەمینییەکان ببەن و دڵ خۆش نەکەن کە بە نرکە و نزا و لالانەوە و پشت بە شێخ بەستن کاریان بۆ دەچێتە سەر، بەڵکو پێویستە لە قورئان حاڵی بن و بەس تەبەڕوکی پێ نەکەن و هەوڵ دەن لە ماناکەی تێبگەن.. بەڵام مەلای گەورە زۆر بە کورتی ئەمەی بەیان کردووە، کەچی شەریعەتی زۆری لەسەر ڕۆیشتووە و زۆرتری لەسەر نووسیوە و جوانتری دەربڕیوە. مەلای گەورە ئەڵێ: " باباگوڕگوڕ شالاوی هەڵسا... بە علم و فەن و هەندەسە زەوتیان کرد و تەمایانە ئەم نەوتە بۆ ئۆروپا

---

[37]) چوار نامیلکەی دوکتۆر عەلی شەریعەتی : ١٨٣ .

بەرن، ئێمە خۆمان لە ماڵی خۆماندا بێ بەش بووین، کەشفی عیلمیمان نـەبوو، ئەو لەناو عـەردی دابوو لێمان بزر بوو، ئەجانب بە دەریان خست، ئێمـەش هـەر خەریکی لەوح بووین.. قەی ناکات لەوێش سەرفی نەزەر. ئەم قورئانە لە (**لوح المحفوظ**)دا بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتە خـوارێ، بـۆ ئـەم وەلی و شـێخانە تەماشای ناکەن؟ هەتا کەمیان بە ڕەش خـوێنیش دەیـزانن.. بـە مـەعنا: هـیچ، ئەویش خراپە، نابێ ئەوان ــکە ئیمانیان هەیە بە قورئان کە کـەلامی خوایـەــ بیزانن ".

(شەریعەتی)ش ئەڵێ: " مـەلا دەڵـێن ئەگـەر عـەرەبیش بزانـی، نابـێ بـەبێ پرسی ئێمە مانا لە قورعان دەیەوە، چونکە پێغەمبەر فەرمووییە: (هەرکەسێ بە ئارەزووی خۆی مانـا لـە قورعـان داتـەوە، لـە ئـاگری جەهەندەمـدا جـێ خـۆش دەکات). ئەوان ئێمە بە جەهەندەم دەترسێنن، بـەڵام خۆیـان بـە ئـارەزووی دڵـی خۆیان مانا بۆ ئایەت دەتاشن و بەهەر بارێ گەرەکیانە دەیچەرخێنن "[38].

لەدوای لاپەڕەیەك دوای وتنی ئەم قسانە یا نووسینی ئەم دێڕانە ئاوا ئەڵێ: " برادەرێکم پێی گوتم: لە زیندانا حەفتا کەس بووین لەسەر سیاسەت گیرابـووین، گشتمان دەربەستی مەزەب بووین، ڕۆژێك ویستم بۆ ئایەتێك چـاوم بـە قورعـان بکەوێ، لە هەرکامم پرسی نـەیبوو. بـەڵام ئـەم حـەفتا کەسـەمان سـەد کتێبـی نوشتە و نزامان لەلا بوو! "[39].

پێش ئەم قسانە بە ڕوونتر ڕوو لە بەتەمەنەکان ئەکا و بە ئیمام پەرستێکیان ئەڵێ: " تۆ قورعانێکت خۆش دەوێ و بە مبارەکی دەزانی کە هـەر بەرگەکـەی

38) هەمان سەرچاوە : ١٨٤ .

39) هەمان سەرچاوە : ١٨٥ .

دەبینی بە نەخش و نیگار ڕەنگاوە و لەسەر تاقە داندراوە و بە پیتی مالّی دەزانی. ئەو قورعانەی كە بە بێداری نایزانی و نازانی باسی چی دەكا، بۆ خەو بن سەرینی دەخەی. بۆ چارەكردنی سەرێشە و پشت و باداریت گەرەكە. لات وایە بۆ زیندوو نابێ، لەسەر مردووانی دەخوێنی. بەشی زۆر لە گۆڕستانان دەخوێندرێ و خێرەكەی بە مردوو دەدرێ، هیچ كات بیرمان نەكردەوە كە لە ماناكەی تێ بگەین و بایەخ بەو پەندانە بدەین كە خودای خاوەن بەزەیی بۆ بەختەوەری و سەروەری و گەشەكردنمان دایداوین.

"پێویستە فەرمانی خودا بخوێندرێ، تێ بگەین و تێ گەیەندرێ. نەك لەسەر ڕفحە دابندرێ و لە دوورەوە تماشای بەرگەكەی بكرێ "[٤٠].

شەریعەتی زۆری وتووە لەسەر داگیركەر و پێویستی بەگژاچوونەوەی، تاكە هۆكاری زیندووبوونەوەی موسولّمانانیش بە قورئان ئەزانێ و وەك چۆن مەلای گەورە دوای باسكردنی داگیركاری و بە تالاّن بردنی نەوت و داهاتی ولاّت یەكسەر ئاماژە بۆ تێگەیشتن لە قورئان ئەكا وەك چارەسەر، بە هەمان شێوە، بەلاّم بە تێر و تەسەل تر، شەریعەتیش باس لەم چارەسەرە ئەكا و ئاماژە بە نموونەی سەردەمی سەرەتای ئیسلام و فتوحات و شۆڕشی تازەی جەزائیریش ئەكا، جا لە باسی شۆڕشی جەزائیردا قسەی یەكێك لە سەركردەكانی شۆڕشەكە ــفەرحات عەبباســ ئەهێنێتەوە كە ئەلّێ: "پەندی شێخ محەمەد عەبدەمان دەگوێ گرت و بامان داوە سەر قورعان و بەماناوە دەمانخوێند و مەلاكان دەچوونە لادێ و مانای ئایەتی قورعانیان بە خوێندەوارانیش دەگوت. لە

[40] ) هەمان سەرچاوە : ١٨٢ .

ماوەیەکی زۆر کەمدا قورعـان زانـین کردیـە کـارێ هـەر مەپرسـە!... هـەمووی کردینـە یـەك هێـز و بـە دەسـتی گـەل دەگـژ فەڕەنـسە ڕاچـووین و کـامڕەوا بووین..."[٤١]. "ژەنەڕاڵی فەرانسەوی (ئارگۆ) ئەڵێ: ساڵان سەرانسەری جەزایر و تـوونس و موریتانیـا و مەراکـشیان تـاڵان دەکـرد، بـەڵام تـاڵانکراوان لەبـەر زیارەتی قەبران و لە ترسی جەهەندەم گریان، وا سڕ ببوون، هەست و خوستیان لێ بڕابوو"[٤٢]، کەچی دوای گەڕانەوە بۆ تێگەیشتن لە قورئان ئـەم وەزعـە ئـاوا نەما و داگیرکەر لە وڵات وەدەرنرا.

٣_ ئـەو خاڵـەی کـە زۆر بـە زەقـی دیـارە و هـەردوو پـەرتووك بـە یەکتریـەوە دەبەستێ و لە بەرچاوان وەکو یەکیان پیشان دەدا، ئەوەیە کـە زمـانی منـداڵ و فیترەت و سروشتی پاکی نەشێوێندراوی ئەو تەمەنەیان تیا کراوەتە دەسـکەلا و زمانی ساوا بەکار هێنراوە بۆ پەردە هەڵماڵین لەسەر بێ عـەقڵیەکانی پیاوانی خۆ بـەخاوەن ئیـسلام زان، مـەلای گـەورە لەسـەر زمـانی منـداڵێکی سـاوا چـەندین پرسیاری لە ڕووکەشدا سادە و لە ناوەڕۆکدا قووڵ ئاڕاستەی باوکی ئەکا، باوکی ڕۆڵی پیاوێکی نەخوێندەواری بە شێخ و مەلا خەڵەتاو ئـەبینێ، د.شـەریعەتیش هـەر بـەناوی نامیلکەکەیـەوە دیـارە کـە خـۆی خـستووەتە جێـی منـداڵێك و پرسیارەکانی ئاڕاستەی دایك و باوکی ئەکا کە دوو بێ ئاگای خۆش باوەڕن و بە قـسەی ئاخونـدو مـەلاکان فریویـان خـواردووە.. خـۆش ئەوەیـە کـە بـاوکی هـەردووکیان، واتـە بـاوکی مـەلای گـەورە و بـاوکی شـەریعەتی، دوو دانـا و شەرعزانی بەتوانا بوون، ئەوەی لە نووسینەکەیاندا هاتووە تەنیا سیناریۆیەکە بۆ

[41] ) هەمان سەرچاوە : ١٨٦ ـ ١٨٧ .

[42] ) هەمان سەرچاوە : ١٨٧ .

دەرخستنی بیرکردنەوەیەکی ساغ و پاك ــکە هی منـدالآن و نـەوەی نوێیـەــ و بیرێکی سەقەتی ژەنگگرتوو ــکە بەزۆری لای پیران و نەخوێندەوارانە.

ئەم جۆرە گفتوگۆیانە هێزەکەیان لەوەدایە کە تێیدا پیاوێکی گەورە ئـەبینی ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە و عارەقەی لە نێوچـەوان نیـشتووە و تـف لـە قوڕگیـدا نـەماوە و لـە بـەردەم منـاڵێکی سـاوا یـان گـەنجێکی تـازە پێگەیـشتوودا گیری خواردووە و قسەی بۆ وتن نەماوە و نازانێ چۆن خۆی لە پرسیارەکانی مناڵەکە بدزێتەوە.. ئەم ئوسلوبە تـەواو لاوازی و پـەرپووتی ڕای ناعـەقڵانیی گـەورەکان ئەخاتە ڕوو و ئاشکرای ئەکا.

٤ــ خاڵێکی تری هاوبەش لە نێوان(فڕی فڕی) و (دایە! باوە!)دا ئەوەیە کـە لـە هەردوکیاندا گاڵتە بە شەفاعـەتی لەخۆڕا کراوە، شـەفاعـەت ــبـە لێکدانـەوەی شـەریعەتیــ لـە(شـەفع) ــواتـە: جووتـەوەــ هـاتووە، واتـە کەسـێك هـاوڕێ و تەواوکەری کەسێك بێت، ئەوکاتە ئەوکەسە بۆی ئەبێ بە(شفیع) و تکای بۆ ئەکا لە بارەگای خواوەندی مەزن، بەم پێیەش بێت (**شفاعة**) هەروا فـشە و هەوانتـە نیە پێویستی بە هەوڵدان و کار بۆکردنە، خۆشەویستیەکی درۆینە بەس نیـە بـۆ ئەوەی بەر شەفاعـەتی چاکان وپاکان بکـەوی، مـەلای گـەورەش بـە دەرخـستنی لاوازی وبـێ دەسـەڵاتی شـێخان لەبەرامبـەر موسـیبەت و کێـشەکانی ڕۆژگـاری ئەمڕۆ، ئەوە ئەسەلمێنێ کە ئەمانە لە ڕۆژی قیامەتیشدا هیچیان پێ ناکرێ.

مـەلای گـەورە دوای ئـەوەی باسـی ئـەوە ئـەکا کـە فڕۆکـە جەنگییـەکانی ئینگلیزی پاوان خواز و داگیرکەر بۆمبارانی شاری کۆیە دەکـەن، لەسـەر زمـانی منداڵەکە ئەڵێ: " ... تەق بۆمبا تەقی، شێخ هەڵات. ئەوجا فڕی فڕی لەترسان باڵی گرت. ئەها ئەها ئەوە غاردەدا بۆ کونێکی خۆی بشارێتەوە، ئای ئای ئەوە

چووە ناو ئەشکەوتەکەوە! ها ها چوشە بنەبانی!!! ". پاش ئەمە لەسەر زمـانی گەورەکان ئەڵێ: " ئەی ماڵی وێرانم. خۆ شێخ هـەڵات وخـۆی شـاردەوە! دەکـوو خانـەت خـەرا بـی یـا شـێخ! ئـەدی لـە زەلزەلـەی ڕۆژی قیامـەت.. لـە سـایقەی ئینشقاقی سەماوات.. لەشەهیق و زەفیری جهەننەم چۆن نەجاتمان دەدا ؟!! ".

مەلای گەورە بەم شێوەیە لە بیرۆکەی (شەفاعەت) ئەدا، کە کراوەتە ساباتێ بۆ حەسانەوە و پشوودانی تەمەڵ و بێ کارەکان.. شەریعەتیش بەوە لە بیرۆکەکە ئەدا کە شتەکە ئەبێتە هەرکـە بۆخـۆی و بەهەشـت ئەبێتـە جێـی سەرسـەری و هەرچی و پەرچیەکان ئەگەر شەفاعەت بەو شێوەیە بێ کە کۆڵکە مەلایان باسی لێوە ئەکەن، بڕوانە بە نموونەیەکی تا ڕاددەیەك درێژ چۆن گاڵتە بە بیرۆکەکە و ئەو کەسانەش ئەکا کـە بـاوەڕی پـێ ئەکـەن: "لـە ڕۆژێکـی عاشـورادا خـەڵکی شـارێك لــە حوســێنیەی شــارەکەیان تۆپــەڵ ببــوون و دەگریــان. لــە مــاڵی خێرەومەندێکیش هەریسە و شلەی عاشورا لێنرابوو کە بدرێ بە شیوەن گێڕان.

"ژنێك لەو شارەدا هەبوو، تەواو داوێن پیس و بەدناو. لەشی خۆی دەفرۆشت و بەو پارە گڵاوە دەژیا ئەو خۆفرۆشە بێ شەرمە ئەوەندە بازاڕی گەرم بـوو کـە هەمـوو ڕۆژگاری ساڵێ ــتەنانەت ڕۆژی عاشـوراشــ بێ کار نـەبوو. لـەو ڕۆژی عاشورایەدا چەند پیـاوێکی هـەرزەکاری گوناهبـاری دەپاڵـدابوو. ژنـەی بەکـەڵ دەبوایە بۆ کەڵەگاکان شیو لێ بنێ دەفریای فراوینیان خا.

"ئاگر نەبوو، دەبوو لەماڵی جیرانان ئاگر بێنێ. مـاڵی کـابرای خێرەومەنـدی دەوڵەمەندیش زۆر نزیك بوو. ویستی لە موبەقی ئـەوان سـەرە بزوتێـك وەدەس خات. ئاگری بن بەرۆشەکان دامرکا بوو، بزووتەکان بە خۆڵەمێش داپۆشرا بوون. ویستی بە فوویەك دوو پۆلوو وەگەشێنێ. مشکی و دووکەڵ چوونە چاوی. چاو

ئاوی کرد، یەك دوو دڵۆپی لیّ وەری.

لەو دەمەش دا ڕەوزەخوان لە باسی حوسێن گەشتبووە ئەم مەبەستە کە ئیمام لە ناو قوڵکەدا قەتیس مابوو؛ کافر دەورەیان لێدابوو....".

تا ئەگاتە: "ئیماندارانی گوێگر دایاندایە قولّپی گریان. دوو تنۆکە ئاوی چاوی ئەو ژنە تیوە بیّ شەرمەش لەو کاتەدا هاتبووە خوار؛ بەبیّ ئەوەی کە گریابیّ و بە بیّ ئەوە هەر بیری لای عاشوراش بێت".

"لە پاش چەند ساڵێك ژنە مرد. خەڵك هەزار جوێن و نەحلەتیان بۆ نارد کەس نەیدەوت ئیمانی برد".

"واهەڵکەوت لە شەوێکا ئەو بەدکارە هاتە خەوی ئیماندارێك، چی ببینیّ! ئەو سۆزمانی کۆنە جندە، ئەوەندە ساز و بەکەیفە خوا بزانیّ. لە پلەی بەرزی بەهەشتا لەگەڵ ژنە بەهەشتیەکانی داوێن پاك تێکەڵاوە و بەوپەڕی خۆشییەوە دەژی. خەونبین هەر واقی وڕما. بەسەرسوڕمانەوە پرسی تۆ چۆن گەیشتویتە ئێرە؟ چۆن لە بەهەشتدا ڕیّ دراوی و ئەویش وا بەقەدر و حورمەت؟"

پاش هەندیّ قسە کە ژنەی بەدکار بۆ ئیماندارەکەی باس دەکا و وێنە حەشری بۆ ئەکێشیّ، ئەڵیّ: "خوایە! منی بابان وێران و سەربەهەش چی بکەم؟ ناهومێد و هیوابڕا و چارەڕەش و سەر لێشێواو، لێم ڕوون بوو بە هیچ ئاوایەك لەم قیرانە ڕزگار نابم. کەچی لەپڕ و نەکاوێك دیتم سیایی گوناهەکانم با بردی. قورعان و تەرازووی حەشر لەلام نەمان. تەنانەت خواوەندی گەورەش لە هەڕەشە گوڕەشەکەی کەم کردەوە. هەڕو گیفی پێشووی نەما. نەم دەزانی خەبەر چیە؛ هەر چاوی خۆم هەڵدەگلۆفی. لام وابوو خەونە دەبینم. لەپڕ دیتم واتکاکاری هەژار و خاکە سەران تەشریفی هات. بە پەلە لە پیلم نەوی و هێنامیە دەر لە

دادگای پڕمەترسی و خستمیە سەر شەقامە ڕێ بەرەو بەهەشت. گوتی بڕۆ! ڕزگارت بوو".

ئەو چیرۆکەی د.شەریعەتی لە مەلایەکی بیستوە و ئەیگێڕێتەوە زۆری بەدەمەوەیە و لەبەر درێژییەکەی من هەمووی باس ناکەم، باسەکە وایە کە ئەو ژنە بەر شەفاعەتی ئیمام حوسێن ئەکەوێ و کە ئەچێتە بەهەشت ئەبینێ بەهەشت پڕە لە هاوشێوەی خۆی، بۆیە لە خەونەکەدا بە ئیماندارەکە ئەڵێ: "دیتم زۆربەی زۆری بەهەشتیەکانی هاومالّم هیچیان لە من کەمتر نەبوون. لات و لوت و چەقۆکێش و گیرفان بڕ و کێشەکڕ و عەوام فەریب و حاجی سوتخۆر و هەتیوبازو درۆکەر و خان و ئاغای گەل چەوسێن و چەتە و دز و تالاّن بەر و کرێگرتەی ئیستعمار و سەرمایەداری بێ بار و لۆتی و پۆتی دامێنتەڕ و ژنی سوك و خۆفرۆش و کۆلاّنگەڕ و لەم جونە بێ فەڕانە بوو..".

ڕزگاربوونی ئەم ژنە خۆفرۆشە تەنها لەبەر ئەو دوو دلّۆپە ئاوە بوو کە لە ڕۆژی عاشورادا بەهۆی دووکەلّەوە لەچاوانی هاتۆتە دەر! شەریعەتی پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە ئەڵێ: "ئەگەر ئەم چیرۆکە ڕاست بێ و چرووك نەبێ، دەبێ بێژین هەرچی فەرمانی خوایە، هەرچی لەناو قەرعاندایە، هەرچی پێغەمبەر بۆی هاتووە، هەرچی ئیمام فەرموویانە، هەرچی دەربارەی جیهاد و شەهیدبوون لە ڕاهی خودا بیستوومانە، هەموو حیکمەت و دەستوور و ڕێ وشوینەکانی عاسمان، هەموو کردەوە و ئاکاری باش و ڕەند و خوا پەسەند و ئەرك کێشان لە ڕێگای دین، سەرانسەری بەرامبەرە بە دوو تنۆك ئاوی چاوی

نەگریاوی بەدکارەیەکی خۆفرۆش!"[٤٣].

٥ - مەلای گەورە و د.شەریعەتی هەردوك ئەوەندە تووڕەن لەو کەسانەی بە درۆ و خورافات زۆج دەبن و فریو دەخۆن کە هەنێ جار جنێویشیان پێ دەدەن، بڕوانە مەلای گەورە دەربارەی هەندێ دەروێش و ئەلقەی لە گوێی شێخان چی ئەڵێ: "داخەکەم ئەوانەی کە زۆر کەرن دووبارە دەبنەوە کەرەکەی جاران، دەچنە خزمەت شێخ و دەست و پێی ماچ دەکەن و دەڵێن: قوربان لەسایەی هیممەتی تۆوە سەلامەت بووین و زیانمان نەهێنا".

"یەکێك لە مریدە هەرە گەورە و گەوجەکان دەڵێ: بە خودا، بە غەوس چاوم لێبوو کە بۆمبا دەهاتنە خوار حەزرەتی شێخ دەستی وەبەر دەگرتن، لە ئێمەی لادەدا".

لەبەرانبەریشەوە بڕوانە شەریعەتی لە دوای هێنانەوەی قسەی مەلایەکی گێلی شیعە، دەربارەی سوودی بازرگانی زیارەتی کەربەلا، چی ئەڵێ: "دە ئاخر چۆن پێ نەکەنم؟ دە یاخوا نووسەری گەورەی سوالکەر و چەورەی نارەسەن! ماڵت بڕمێ بۆ کەریەتیت! ئەگەر بۆ خۆت گێل و حۆل و ماڵ وێرانی، خەڵکی بۆ بەکەر دەزانی؟ من نالێم مێشکت کاربکا، بەلام هەر چاوت کوێر نەبا و دەور و بەری خۆتت دیبا، دەتزانی کە شیرکەتێکی چکۆلەی بازرگانی لە ژاپۆندا چەند ئەوەندەی بێنەو بەرەی ئالوگۆڕی ماڵ و کالای تێدا هەیە".

٦ - ئەگەر بەوردی بڕوانینە هەردوو نامیلکەکە باش تێدەگەین: هەردوو نووسەر باش لەڕای خەڵکە بێ ئاگاکان و خورافە پەرەستەکان حاڵی بوون و لە تانە و

---

[43] ) هەمان سەرچاوە : ١٥٥ ـ ١٦٠ .

تەشەرەکانیان نەترساون و باکیشیان نەبووە هەرچیشیان پـێ ئـەڵێن و چیان لـە بارەوە ئێژن.. مەلای گەورە لەسەر زمانی بـاوکێکی شـێخ پەرەست بـە منداڵـە وریا و چاو کراوەکەی کە پرسیاری ژیرانـەی لێ ئـەکاو ئـەم وەڵامەکـەی نازانـێ چەندین جنێو ئەگێڕێتەوە، بۆنمونە: "هەی ماڵ وێران! تۆ ئیمانـت نیـە، کـافری، زەندیقی، لە دین دەرچوی.." یان: "سـەیری ئـەم هـەتیوە بێژیـە، ئـەوە دەرسـی شەیتانیە، بە قسەی مەلایان باوەڕ ناکات" یا: "ئەی لەو ماڵ خراپە! ئەتۆ چیت بەسەر شتی واوەیە؟ واللە ئەوە شەیتانە، سەرم بە فەتەڕات دەدا"!

شەریعەتیش قسەی ئاخوندە مەزار پەرستەکان لە بارەی خۆیەوە بـاس ئـەکاو ئەڵێ: " ئەمجارە بابزانین مەلاکان چیم پـێ دەڵـێن؟ ئـەم کـاورا سمێـڵ تاشـراوەی شەپکە لەسەرەی بێ فەڕەی مل بەپـەتی کافرانـە پێـچراوە کێیـە؟ کـێ ڕێیـداوە دەسـت دەکـاری ئێمـە وەردا؟.. ئـەم تـازە لـە کافرسـتان هاتۆتـەوە، ئیمانەکـەی دۆڕاندووە. گەرەکێتی باجدەرە مسکێنەکانمان فریو بدا و لەڕێ دەرکا و نـەهێڵێ بە گوێمان بکەن. ئەم ئاژاوە چییە کافرە، فرەشـووی لێ هەڵکێـشاوە؛ پێویـستە لەناوی بەرین "[44].

٧- بەم خاڵە کۆتایی بە بەراوردە سـەرپێییەکەم دێـنم، ئـەویش هەنـدێ قـسەی هـەردوو نووسـەرە کـە زۆر پێـك دەچـن لـە بـارەی داهـاتووی لاوان و خراپـی پەروەردەی گەورەکانەوە، بەتایبەت داواکانی هەردوکیان لە هەردوو چینی پیران و لاوان.

مەلای گەورە خوا پلەی بەرزکا ئەڵێ: " ئەی ئامان، ڕەبی دەخیل.. ئەوە چی

[44]) هەمان سەرچاوە : ١١٢ ـ ١١٣ .

بوو؟ چۆن وای لێهات؟ ئەو هات و باتی کەرامەت و حیکایەتە بەجارێ ئێمەی گۆڕی، ئەگەر لێ گەڕابان هیچ نەبا لەجێی خۆمان دەماین و ئەوەندە بە عاردیدا نەدەچوینە خوارەوە ".

د.شەریعەتی ئاوا ئەڵێ: " ئەگەر بتوانی حاجیاغا و ڕۆڵەکان لەبەر یەك ڕاگری و سەرپۆش لەسەر هۆشیان داگری، دەزانی ئەو منداڵانە لەچاو ئەو باوکە چەند زانا و دانا و زرینگ و وشیارن ".

لە جێیەکی تردا مەلای گەورە ئەڵێ: "...منداڵە سونی، بەتایبەت منداڵی کوردان، قەت لە زەکای **فطری** خەلق ناگۆڕێن، لەسەر ئەو بێ کەسیە ئیمڕۆ شوکر منداڵی کوردان بە نەوعێ بۆ ئەوجی ئەعلا دەفڕن هەرچی دۆستە حەق وایە کەیفی پێ بێ، چونکو زۆر باش دەخوێنن، عاقیبەت بۆیان باش ئەبێ، دەچن بۆ بلٚندترین پایە"[٤٥] .

شەریعەتیش ئەڵێ: " باوکی بەڕێز! پێت خۆش بێ یان لات گران بێ، زۆر هەڵەی و لە تەڵەی هیچ نەزانیندا گیرۆدەی بووی! بەڵێ کوڕت یا کیژەکەت لە سەرەتا منالٚی شلك و ساوا بوو؛ هەرچۆن خۆت دەفەرمووی وابوو. دەستت گرت بە دارە_دارە فێری بەڕێوە چوونت کرد، تێت گەیاند تارەت گرتن و دەستنوێژ هەڵگرتن چۆن ئەبێ، هەرچی دەربارەی زەیارەتی ئیمام زادەوە دەتزاتی بەویشت گوت. واتە بەقەد خۆت زانات کرد. بەلاٚم ئەم کیژەت، ئەو کوڕەت، لە فێرگەی سەرەتاییڕا تا ناوەندی تا چۆتە پلەی دانشگا گەلێك شتی وا فێربووە کە بۆنیشت نەکردووە"[٤٦] .

[45] ) هەمان سەرچاوە : ١٢١ .

[46] ) هەمان سەرچاوە : ١٢٢ .

دوا قسه و دێڕەكانی مەلای گەورە باسی ئەوە ئەكا كە ئەقلّ و عیلم لە نـاو موسولّمانان " نەمایە، فڕیە، ڕۆیشتیە.. لام وایە نایەتەوە، مەگەر مندالآنێ كە تازە پێ دەگەن فێلّەكی بكەن، فاقە و داوێكی دابنێنـەوە بـەلّكو تـەیری علـم و عـەقلّی پێوە دەبێ، دەیگرنەوە، ئەویش لازمە باوكەكانیان لێیـان گـەڕێن لەسـەر عـەقلّی **فطری** گەورە ببن، لێیان نەگۆڕن ".

دوا دێڕەكانی د.شەریعەتیش لە(دایە! بـاوە!)دا ئاوایـە: " ئێمـە دەبـێ ئـازاد بیركردنەوە، ئازاد ژیان بخەینە مێشكی خەلّكەوە. كارێك بكەین لاوەكانمان وێڕای كـاروانی شارسـتانیەتی گەشـەداری ئـەم زەمانـە بخەینـە ڕێ و نەشـهێلّین دینـە ڕاسـتەكەی ــكـە خـوا و قورعـان فەرمـوویانــە ــ لـەدەس بـدەن. قورعانەكـەش نەكەینە تەلیسمی دێوان، لامان وابێ هیچ كەسێ ناشێ بیزانێ "[٤٧].

هەر وەك ئەلّێ: " باوە! دایە! ئەم دنیایە ــكە ئێـوە لێـی بـێ خەبـەرن ــ زۆر گۆڕیاوە. دوژمنانمان زۆر بـەهێزن. ئەگـەر ئێمـەش بـە بـیر و بـڕوای تـازەوە خـۆ نەنوێنین بەرگەی لێشاوی ڕۆژاوای زانا و چاوچنۆك ناگرین "[٤٨].

ئەوەی بە كورتی ئاماژەمان پێدا چەند خالّێكی هاوبەش و هاوشێوە بوو لـە نێوان دوو نامیلكەی (فڕێ فڕێ قەل فڕێ)ی مـەلای گـەورە و (دایـە! بـاوە! كـێ خراوە؟)ی د.عـەلی شەریعەتی دا، ڕاستی ئەگەر كەسێك كـاتی زیـاتری هـەبێ و وردتر سەیریان بكا شتی جوانتریشی دەست ئەكەوێ و بۆی ڕوون ئەبێتەوە، بەلاّم ئەمەی ئێرە تەنیا سەرنجێكی خێرا بوو بۆ ئـەم نامیلكـەی بەردەسـتی خوێنـەری بەڕێز و هیچی تر.

---

47) هەمان سەرچاوە : ٢٣٠ .

48) هەمان سەرچاوە : ٢٣١ .

## کارەکەم لەم چاپەدا :

بەکورتی من لە دووبارە لەچاپدانەوەی ئەم نامیلکەیەی مامۆستا محمدی جەلی کۆیی دا چەند کارێکم کردووە:

١ــ نووسینی چەند دێڕێکی کورت لەبارەی ژیانی مامۆستای نووسەرەوە کە نووسەر بەو خوێنەرە گەنجانە ئەناسێنێ کە تا ئێستا گەورە زانایەکی وەك مەلای گەورەیان نەناسیوە.

٢ــ تۆمارکردنی ناوی بەرهەمە نووسراوەکانی مامۆستای خوالێخۆش بوو، کە چەند دانەیەکیان چاپ کراون و زۆربەیان بە دەسنووسی و چاپ نەکراوی ماونەتەوە تا ئێستا.

٣ــ دەرخستن و پیشاندانی چەند لایەنێکی گرنگ لە ژیان و کەسێتی مەلای گەورە، کە زیاتر گەورەیی و بلیمەتی ئەم پیاوەمان بۆ دەرئەخات.

٤ــ بەراوردکردنێکی خێرا لە نێوان ئەم نامیلکەی مەلای گەورە و نامیلکەکەی د.عەلی شەریعەتی (دایە! باوە! کێ خراوە؟)کە مام هەژار کردوویەتی بە کوردی.

٥ــ دووبارە نووسینەوەی (فڕی فڕی) بە ڕێنووسی تازەی کوردی، چونکە لە چاپەکەی ﴿(١٩٥٧)ی چاپخانەی کوردستان لە هەولێر﴾دا زۆر پیتی کوردی بە ڕێنووسی عەرەبی نووسراون وەك (ئـ) کە بە (أ) نووسراوە، من هەوڵمداوە هەموو ئەو پیتانە وەکو ڕێنووسە ڕاستەکەی بنووسم.

٦ــ ڕوونکردنەوە و ماناکردنی زۆرێك لەو وشانەی کە بۆ لاوە خوێنەرەکانی ئەم

دەور و زەمانە گرانن، چ ئەو وشە عەرەبیانەی کە زۆر بەکار هاتوون، چ ئەو وشە کوردیانـەی کـە هـی شـێوەزاری ناوچـەی کۆیـە و هـەولێرن و خـەڵکی نزیکـی سلێمانی و گەرمیان باش لێیان حاڵی نابن.

٧ــ هەروەها لە پەراوێزدا هەندێ ڕووداو و باسم ڕوونکردووەتەوە کە پێویستیان بە روونکردنەوە هەیە، چونکە چاپەکەی (١٩٥٧) تەنیا (٣) پەراوێزی هەیە کە چەند شتێکی کەم زۆر بەخێرایی ڕوون ئەکاتەوە، من ئەو پەراوێزانەم وەك خۆی نووسیوەتەوە و هەندێ پەراوێزی ترم بۆ داناوە.

لە کۆتاییدا حەز ئەکەم دوو تێبینی بخەمەڕوو:

١ــ هۆی دووبارە لەچاپدانی ئەم نامیلکەیە زیاتر ئەوە بوو کە چاوم کەوت بـە چاپەکەی (١٩٥٧) و خوێندمەوە بینیم سەرەڕای تێپەڕبوونی ئەو هـەموو سـاڵە بەسەر نووسین و چاپکردنی دا کەچی ناوەڕۆکەکەی هەر تازەیـە، یـان ناشـوکری نەبێ عـەقڵی خەڵکی هەروەك خۆی و بە کۆنی ماوەتەوە، بەتایبـەتی لـەم یـەك دوو سـاڵەی دواییـدا دیـسان لێـرە و لـەوێ کەسـانێك دەرکـەوتوون بـەناوی (شـێخایەتی و مەهـدی بـوون و کەرامـەت و شـیفادان)ەوە خـەریکی قـۆڵبڕینو چاوبەسکردنی خەڵکی ڕەش و ڕەجاڵ و داماون، یان هەندێ کۆڵکە مـەلا ــکـە نـاوی مـەلا و زانـا پـاك و چـاکەکانیش ناشـیرین ئەکـەن ــ بانگەشـەی شـەخس پەرستی و قەبر پەرستی و پەنابردنە بەر ئەولیا و ئەوسیا ئەکەن و بێ شەرمانە هانی خەڵکی ئەدەن بۆ هاوەڵ بڕیاردان و لە خوا دوورکەوتنەوە. هەربۆیـە زۆرم بە پێویست زانی ئەم نامیلکەیـە دووبـارە لەچـاپ بدرێتـەوە، بەتایبـەت لەبـەر ئەوەی شـێوەی نووسـینەکەی کـە ڕەخنـە گرتنێکـی پـڕ لـە گاڵتـە پێکردنـە زۆر گونجاوە بۆ وەڵامی ئەو کەسانە، چونکە من وەڵامی زانستی بە شایەنی ئـەوان

نازانم، یان ئەوان شایەنی خۆ هیلاك کردن و بەڵگە هێنانەوە نین، بەڵکو ئەم شێوە وەڵامەی مەلای گەورە سەروزیادە!

٢_ وەك ئیشارەم بۆ کرد، زۆربەی نووسینەکانی مامۆستا مەلای گەورە وەك زۆرێك لە زانا بلیمەتەکانی ترمان تاکو ئەمڕۆ بە چاپ نەکراوی ماونەتەوە، جا ئێرە جێی خۆیەتی تێیدا داوا بکەم لە کەسانی دڵسۆز، پێش هەموولا ڕووی دەمم لە برایانی نووسینگەی (تەفسیر)ە•، کە خەمێکی بەرهەمەکانی مامۆستا بخۆن و چیتر نەهێڵن لە تاریکی سوچی کتێبخانەکەیماڵی مامۆستادا بمێنێتەوە و هیممەتێ بکەن و وەکو تەفسیرەکەی بیخەنە پرۆژەی لەچاپدانەوە.

پاش ئەم پێشەکییە کورتە، لە پەروەردگاری میهرەبان دەپاڕێمەوە کە ئەم کارە ناقابیلەم بە خێر لێ قبوڵ کات و پاداشتی هەموو ئەو کەسانەش بداتەوە کە لە ئامادەکردنیدا هاوکارییان کردم، بەتایبەت هەرسێ قوتابی خۆشەویستم (شڤان ئیبراهیم) و (ئەحمەد موحەممەد) و (نەهرۆ فوئاد).

***ربنا تقبل منا إنك أنت السميع العليم...***

**قانع خورشید**

**صمود -شەوی جمعە لەسەر شەممە**

**٢٢|رجب|١٤٢٩ك _ ٢٥|٧|٢٠٠٨ز**

---

•) بۆیە بە تایبەت ڕووی دەمم لەو برایانە کردووە، چونکە وەك بزانم بنەماڵەی مەلای گەورە سەرپەرشتی لەچاپدانی زۆرێك لە نووسینەکانی مامۆستایان داوەتە دەستی ئەوان.

**بۆ ئامادەکردنی ئەم پێشەکییە سوودم لەم سەرچاوانەوە وەرگرتووە:**

١_ چوار نامیلکەی دوکتۆر عەلی شەریعەتی، وەرگێڕانی هەژار، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس چ١ هەولێر ٢٠٠٦.

٢_ فڕی فڕی قەل فڕی، مەلا محەمەدی جەلی (مـەلای گـەورە)، چ١ چاپخانەی کوردستان _هەولێر ١٩٥٧.

٣_ گەشتی ژیانم، مەسعود محەمەد، چاپی یەکەم _ ستۆکهۆڵم ١٩٩٢.

٤_ لەسەرگوزشـتەکانی ژیـان، شـێخ موحەمـەدی خـاڵ. چـاپی یەکـەم _ لەبڵاوکراوەکانی پرۆژەی تیشك ٢٠٠٧ز.

**٥_ مد بن عبدا ا لمي** (مەلای گەورە) **و جهوده العلمية، د. جواد فقي علي** الچۆم **حيدري. مكتب التفـسـ** _ هـەولێر **الطبعـة الأو ١٤٢٧_ ٢٠٠٦.**

٦_ **مسعود مد، تأليف: يد ا طبعي، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد. الطبعة الأو ١٩٨٨.**

٧_ مەسعوود محەمەد (ژیان نامە و ڕۆڵی لە بزوتنـەوەی ڕۆشـنبیری کوردیـدا)، دەسنوسـی توێژینـەوەی خوێنـدکار (لقمـان محمـد قـادر) کـە وەك بەشـێ لـە پێداویستییەکانی پلەی بەکالۆریۆس لە مێـژوودا پێـشکەشی بەشـی (مێـژوو)ی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی کراوە. بـۆ ساڵی خوێنـدنی ٢٠٠٢_٢٠٠٣ز.

ئینسان ئەگەر بە گەورەیی ئەحواڵی منداڵی لە یاد بێ قیاس لە ئەحواڵی گەورەیی بکات فەرقێکی زۆر سەیر دەبینێ و ئەگەر بە چاوی دڵ تەماشاکا دەزانێ ئەو فکرەی کە لە ساتی منداڵی دا هەیبوو زۆر پاك و زۆرچاك بوو، ئەمما بە تەربیەی دایك و باوك و کەس وکاری فکری لێ گۆڕاو لێیان تێکدا.

لەیادمە بە مناڵی گەمە _یاری_ یەکمان دەکرد (فڕی فڕی قەل فڕی)، چەند منداڵی دەوریان لێك دەدا، یەکێ ناوی چەند باڵندەیەکی دەهێنا، لەگەڵ ناوی باڵندەکە مناڵەکان دەستیان بەرز دەکردەوە و لەو میانەدا ناوی چشتێکی دەهێنا کە نەفڕێ، ئەوی دەستی هەڵبڕیبا تێدەکەوت. ناوی ئەو شتە نەختێك وێچوو[49] بوو لەگەڵ ناوی باڵندەیەکی، بۆیە ئەو منداڵە لێی تێك دەچوو، **مثلاً** دەیگوت فڕی فڕی، فڕی فڕی کۆتر فڕی، فڕی فڕی کۆتك[50] فڕی. ئەوی دەستی بڵند کردبا تێدەکەوت و منداڵەکان تێر پێی پێدەکەنین و گەمەیان پێ دەکرد، فڕی فڕی قازی بازی فڕی، فڕی فڕی قاز فڕی، فڕی فڕی **قاضی**[51] فڕی. دیسان تێدەکەوت، چەپڵەیان بۆ لێدەدا، قەشمەری _گاڵتە_ یان پێ

49 ) هاوشێوە بوو، بەودەچوو.
50 ) تووتك، بێچوە سەگ.
51 ) دادوەر، قازی.

دەکرد، یەعنی ئەو منداڵانە بە فکری **فطـري** خۆیان جیاوازی و تەمیزێکی باشیان هەبوو چی دەفڕێ و چی نافڕێ، چۆن دەفڕێ و چۆن نافڕێ، بەچی دەفڕێ، بە چاکی دەیانزانی.

لە پاش گەورە بوون و هۆشی قەوم وەرگرتن.. دەبینین فەرقێکی زۆر هەیە، بەجارێ ئیش سەرەو بن بووە. ئیمان بە کەرامەت فکری **فطـری** بەتەواوی گۆڕیوە، **مثلاً:** بەهیممەتی شێخ فڕی فڕی کەر فڕی، دەبێ دەست بەرزکەی. فڕی فڕی شێخ بەخۆی فڕی، دەست بەرزکەی. هەیهاوار.. بۆ خاتری خوا.. بۆ خاتری پێغەمبەر! چۆن دەست هەڵبڕم؟ ئەو کەرە گوێ درێژە.. ئەو شێخە سەر زلەی ورگ پانی مل ئەستوورە چۆن دەفڕێ؟!

هەی ماڵ وێران تۆ.. ئیمانت نیە، کافری، زەندیقی، لە دین دەرچووی، نازانی شێخ خۆشەویستی خودایە، ئەمە کەرامەتی ئەولیایە. تۆ نەت بیستوە لە مەلایانی موتەبەحیر کەرامەتی ئەولیا حەقە؟ هەر چێکی لە خوا بخوازێ بۆی دەکا، تۆبە بکە دەست هەڵبڕە.

برام لازم نیە ئەوی خۆشەویستی خودا بی بفڕێ، فڕین قاعیدەی هەیە.. پێغەمبەر، ئەبوبەکر، عومەر، **عثمـان**، عەلی خۆشەویستی خودا بوون و نەفڕین، بەڵان چوێلەکەی دەفڕێ و خۆشەویستی خوداش نیە. کورە ماڵ ڕماو! ئەوە چشتێکی ترە، وەرە ئیمان بێنە، دەنا شێخ غەزەبت لێ دەگرێ، خوداش لێت خۆش نابێ، پێغەمبەریش شەفاعەتت

بۆ ناکات.. خولاصە بە سەد دەسیسەو فڕوفێڵ منداڵەکە وەردەگێڕن و لەسەر فکری **فطری** حەقی لادەدەن.

دیسان: فڕی فڕی فڕۆکە ـ**طیـارة**ـی ئینگلیزی فڕی، هاتە سەر شاری کۆیە[52] بۆردومانی دەکات.

منداڵە پاکەکە خێرا دەست هەڵدەبڕێ، گەورەکان دەست هەڵنابڕن.

مندڵەکە دەپرسێ: بۆچ دەست هەڵنابڕن؟ دەڵێن: بڕۆ کەرە.. چ حەددی هەیە! فڕۆکە چیە.. چۆن دەفڕێ؟ ئەوانە کافرن، چۆن بەحەوا ـئاسمانـ دەکەون؟ خۆ شێخ و ئەولیا نین بفڕن!؟!

منداڵەکە: وەرن بۆ خاتری خودا دەست هەڵبڕن دەنا زەرەر دەکەن.. بەخوا ئەوە هات، گڕەی دێ، بۆمبای زۆر پێ یە، یەکەکتان پێدا بدا بەر بکەون؛ هەموو پارچە پارچە دەبن.

گەوەرەکان: بڕۆ منداڵی نەفام.. تەماتە هەڵمان خەڵەتێنی تا تێ‌کەوین و پێمان پێبکەنی!

منداڵەکە: بەخوا مەبەستم ئەوە نیە، بۆ ئێوەمە، حەیف دەکەم بفەوتێن..

گەورەیەك: ئەها بەخودا ئەوا هات.. کوڕەکە راست دەکا، تەقەی

---

[52]) لەساڵی١٩٢٤دا ئینگلیز شاری کۆیەی بۆمباران کرد.

بۆمبای هات لەبەر "قشلە"ی[53] ، تـەقی.. عـاردی لەرزانـد دەنگێکـی زۆر بەهێزی هات، هەر وەخت بوو پەردەی گوێم بدڕێتن، ئـەمما مەترسـن شێخ بە هیممەت ناهێڵێ زیانمان پێ بگات.

منداڵەکە پێکەنی و وتی: باوکم! خۆتان بشارنەوە ئەوە ئیشی شێخ و مێخ نیە! ئەها، هاا هاا... بنۆڕن! شێخ ئـەوا بـۆ خۆشـی هەڵـدێ. تـەق بۆمبا تەقی، شێخ هەڵات. ئەو جا فـڕی فـڕی و لـە ترسـان بـاڵی گـرت. ئەها ئەها ئەوە غاردەدا بۆ کونێکی خۆی بـشارێتەوە، ئـای ئـای ئـەوە چووە ناو ئەشکەوتەوە! هاها چووشە بنەبانێ!!!

گەورەکان: ئەی مـاڵی وێـرانم، خـۆ شـێخ هـەڵات و خـۆی شـاردەوە!! دەکوو خانەت خراپ بی یا شێخ! ئەدی لە زەلزەلەی رۆژی قیامەت و لـە صاعیقەی ئینشیقاقی سەماوات و لەشەهیق و زەفـیری جەهەننـەم چۆن نـەجاتمان دەدا!؟! داخەکـەم پـەکوو چـۆن عـەقڵی لـێ گـۆڕین بـە درۆو دەلەسە، کوو ماڵی خواردین!!! لـەدین و دونیـای کـردین! بـە خـودای هـەمووی درۆ بـوو! هیممـەتی پڵاوخـواردنی لـێ کـردین بـە هیممـەت هیممەت و بەرەکەتی، وی تـەنها بـۆ مـاڵی مفـتی بـوو.. تـەق، تـەق، تەق... بۆمبا بارینە، جێی قسە نەما، هەڕاکەن، هەڕاکەن، چارەسـەرە، رۆژی نەفسی نەفسی یە. فڕی فڕی شێخ فـڕی، مـەلا فـڕی، ئاغـا فـڕی،

---

[53] ) قشلە: بینایەکە محمد پاشای رەواندز، کەناوبانگی پاشای کۆرەیـە، لەسـەر گـردی کـۆن بینای کردووە کە کەوتووەتە باکووری رۆژاوای کۆیەوە.

ئەفەندی فڕی، مام حاجی فڕی، صۆفی فڕی، دەروێش فڕی، سەگ فڕی، مریشك فڕی، هەموو فڕین.. چوونە پەنایان.

منداڵەکان: ئەدی وا بفڕن دەنا تێدەکەون، قوڕ بەسەرتان ئەگەر بەشەو هات، بە ئەلکتریك[54] دونیای رووناك کرد، لەسەربانان، لەناو حەوشان، لە کۆڵانان، هەمووی دیتن، ئەوجا چی دەکەن؟

گەورەکان: تو خوا ئەمیش دەبی؟ ئەوجا قوڕی کوێ کەین بەسەر خۆمان؟ کێوە بچین؟ کێوە بفڕین؟ دەبی زەوی بکۆڵین و بچینە بن عاردی.

ئەوا فڕۆکە گەڕاوە، چووە کەرکوك الحمدالله یارەبی، ئەو جارەش قوتار بووین.

داخەکەم ئەوانەی کە زۆر کەرن دووبارە دەبنەوە کەرەکەی جاران و دەچنە خزمەت شێخ و دەست و پێی ماچ دەکەن و دەڵێن قوربان! لەسایەی هیممەتی تۆوە سلامەت بووین و زیانمان نەهێنا.

یەکێك لە مریدە هەرە کەرو گەوجەکان دەڵێ: بە خودا، بەغەوس[55]،

---

[54] ) کارەبا.

[55] ) **(غوث)**: یا کورد گوتەنی غەوس: نازناوێکی هەڵەو ناشەرعیە کە دراوەتە پاڵ شێخ عەبدولقادری گەیلانی، گوایە هەرکێ هاواری پێ بکا دێتە هانایەوەو فریای ئەکەوێ، وشەکەش چاوگـ_مصدر_ی فریاکەوتنە لە زمانی عەرەبیدا، کە سیفەتێکە تەنیا لایقی خوایەو بۆ هیچ کەسێ ڕەوا نیە بەکاربێ.

چاوم لێ بوو کە بۆمبـا دەهاتنـە خـوار حـەزرەتی شـێخ دەسـتی وەبـەر دەگرتن و لە ئێمەی لادەدا، صدق صـدق.. **آمنا آمنـا**.. هیمـەتی شـێخ کافیە، **ظـاهراً** خـۆی شـاردەوە.. **باطنـاً** هیممـەتی فـەرمووە.. شـکور دەرچووین، کورە هەر شێخ حسابە...

منداڵەکە وەختە لـەقینان بـدڕێ و تـەق بکـا. ئـەو جـارەش فڕۆکـەی ئینگلیز فڕی لەکەرکوك، لـە بەغـداد، لـە موسـڵ، وەك قـازو قـولێنگ لەسـەران دێنـە خـوارێ و ئـەوا لەهـەموو لایەکـەوە هـاتن وجـێ بـەجێ کردیانە ئاگر باران، قیامەتـە.. عالـەم بەلـەرزە لـەرزەوە دەسـتیان بـە هەڵاتن کرد. هـاوار یـا **غـوث یـاغوث، یـاغوث**، شـاهی نەقـشبەند، ئۆمەرمەندان، خارخاران، پیرەمەگروون، پیرۆتە سووری مـەرگی، پـیری دابان، **نجـات**، **حفظ**، هـاوار، دەخیـل. دیـسان بـەو چەشـنە هـەموویان خۆیان بزرکرد و خۆیان شاردەوە، گەلێ مزگەوت و تەکیە بەبـەر بۆمبـا کەوتن و رمان و خراپ بوون. دووبارە کە ڕۆیـشتنەوە خـەڵکی هاتنـەوە دەرێ زۆر ترسان، ئەسەری تەجروبەیان دیت کەمێك هاتنەوە سەرهۆش، تەمایان بوو نەختێ عاقڵ بن، بەڵان کە هێندێکیان چوون بۆ لای شـێخ، شێخ نەمابوو، مەلا نـەمابوو، هـەموویان باڵیـان گرتبـوو، فـڕی بـوون. ئەوجا گوتیان بەڵێ بەخودا لێمـان گـۆڕاوە، هـەر شـتە قاعیـدەی خـۆی هەیە، ئێمە بە حیکایەتی قاڵیچەی سلێمان پێغەمبـەر و باسـو خواسـی عیفریتان تێکەوتین، شێخان هەڵیان خەڵەتاندین، فلان سواری قالیـچەی

سلێمانی بوو، گوتی بەحەقی سلێمان ببمە فلانە جێ، دەست بەجێ بردی، عفریتان قەڵای کچی پادشایان هەڵگرت بەبناغەوە بردیانە ناو حەوت دەریایان و لە جەزیرەدا دایاننا. بە عزێ لە ئەولیایان دیتویانە کە کەعبە لە جێی خۆی نەماوە، چووە بەپیر ڕابیعەی عەدوییە[56]. ئەی ئامان، ڕەبی دەخیل، ئەوە چی بوو؟ چۆن وای لێ هات؟ ئەو هات و باتی کەرامەت و حیکایەت بەجارێ ئێمەی گۆڕی، ئەگەر لێگەڕابان هیچ نەبا لەجێی خۆمان دەماین و ئەوەندە بە عاردی دا نەدەچوینە خوارەوە[57]، وەك لەحیکایەتی دا دەڵێ: ئەحمەد کەوتە ژێر زەمین، پێیان

[56] ) رابعة العدوية: ژنە سۆفی و لەخواترسی سەردەمی تابیعینە، کە زۆرێك لە زانا خواناسەکان دەچوونە خزمەتی بۆ پاککردنەوەی دڵ و دەروونیان و یادکردنەوەی پەروەردگاریان.. جا پاش چەند ساڵێك لەمردنی ئەم ئافرەتە خواناسە، وردەوردە هەندێ لە شوێن کەوتوانی تەریقەت ـ گێل و وێلەکانیان ـ دونیایەك درۆیان خستووەتە پاڵ رابیعە، گوایە ئەمانە کەرامەت و رێزی خوایین بۆ ئەم زاتە موبارەکە، درۆکان لەوە زەقترن پیاوی ژیریان پێ بخەڵەتێ، بەڵام هەندێ فەقیرحاڵ هەن کە باوەڕ بە شتی لەوە سەیرتریش ئەکەن، چونکە مۆرکی ئاینیان پێوە نراوە.. یەکێك لەو درۆیانەی دراوەتە پاڵ رابیعە ـ خوا لێی رازی بێ ـ ئەوەیە کە گوایە کاتێك چووە بۆ حەج کەعبە لە شوێنی خۆی نەماوەو هاتووەتە پیریەوە بۆ ئەوەی ماندوو نەبێ!! کەچی پێغەمبەری خوا پێنج سەد کیلۆمەتر رێگەی لە مەدینەوە بۆ مەکە بە پێ بڕی و کەعبەش لەجێی خۆی نەجولاو کافرانیش= نەیانهێڵا بچێتە ناو مەککەوە ـ ئەوە بوو سولّحی حودەیبییە رووی دا ـ، تۆ بڵێی رابیعەی عەدویە پلەی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەرزتر بێ؟!!

[57] ) مەبەستی مامۆستا ئەوەیە ئەگەر بەم قسە پڕوپووچانە مێشکیان تێك نەدابایین، هیچ نەبێ بە فیترەتی پاکی منالّی ئەماینەوە، ئەگەر هیچیش فێر نەبایناية و عاقڵتر نەبوایەین

گۆت: دوو بەران دێـن رۆژی جمعـە، خـۆت هەلّـدە سـەر بەرانـە سـپیەکە بەسەر ئەکەوی، ئەگەر بکەویە سەر بەرانە ڕەشـەکەی لەحـەوت تەبـەقی زەوی ڕۆدەچیت. قورِ بەسەر، خۆی هەلّدا کەوتە سەر بەرانە رەشـەکەی و کەوتە بن حەوت تەبەقی عاردی، چی بکەین تاوانی ئێمە نەبوو.

مەلای چاك لە وەعزی دا دەیفەرموو: فلاّنە کەس بەهشتاوی دەچێتە مەکە، دەفڕێ دەچێتە ئاسمان، **سـدرة** المنتهی، بەهەشت، کورسی، عەرش، هەمووی دەگەڕێ، نـەمان دەوێـرا دەنـگ بکـەین، کەرامـەتی ئەولیا حەقە لە کتێبی عەقیدە نووسراوە وەك مـوعجیزەی پێغەمبـەران دەبێ ئیمانی پێ بینین.

منداڵ بە منداڵی بە فیترەتی ئیلاهی زۆر زیرەکە، دیارە پرسیار دەکا.. دەڵێ: بابە! ئەو بارانە کوو دەبارێ؟ کوو وا دەنك دەنك.. تنۆکە تنۆکە دێتە خوارێ؟؟؟

باب: رۆڵە ئەوە مەلائیکەت دەچن لـە بـەحری(**رزق مقـسوم**) ئـاوی دەیێنن، بە بێژنگی دادەکەن، وەك دەنکە گەنم و جـۆ لەبێـژەنگی دێتـە خوارێ، ئەمن لە مەلا وام بیستوە.

منداڵ: ئەدی بابـە! بۆچـی هەنـدێ جـاران بەرِێژنـە دەبـارێ، دەنکـی

---

خۆ خراپتر نەئەبووین، بەڵام بە پـەروەردەی سـەقەت و باسـی خورافیـات وایـان لێکـردین لـە منالّی ناحالّیتر بین و لەجیاتی ئـەوەی تـا گـەورەتر بـین عـاقلّتر بـین، ئێمـە تـا گـەورەتر بـین ناحالّیتر و بێ فەرِتر ئەبین!

گەورەیە، جارجاریش نەرمە نەرمە دەبارێ دەنکی ورد ورد دێتە خوارێ وەك خوناوی ڕەشمالان؟ بەپێی فەرموودەی تۆ دەبێ بێژەنگ وسەرەدو هێڵەکیان هەبێ!

باب: سەیری ئەم هەتیوە بێژەیە[58]، ئەوە دەرسی شەیتانیە، بەقسەی مەلایان بڕوا ناکات.

منداڵ: ئەدی بابەگیان! ئەو بروسکەو گرمەی هەوری چیە؟

باب ـ ئەگەر سوننی بێ ـ دەڵێ: ڕۆڵە! ئەوە مەلائیکەتێکە بە قەدەر زەنگە سوورەیەکی ـ زەردەواڵە ـ قەمچیەکی ئاگرینی بەدەستەوەیە، لەهەوری دەداو بەسەریدا دەهاڕێنێ، ئەو برووسکە ئاگری قەمچی ئەوە، ئەو نەڕەیەو دەنگە گەورەیەش هەر هی ویە.

منداڵ: ئەدی بابە! جارجارە برووسك لە عاردی دەدا ئینسان و حەیوانی دەسوتێنی، لەو جێیە بۆنی باروتی لێ دێ و هەندێ جاران لەو جێگایە ئاسن دەدۆزرێتەوە.

باب: ئەی لەو ماڵ خراپە.. ئەتۆ چت بەسەر شتی واوەیە؟ واللە ئەوە شەیتانە، سەرم بە فەتەڕات دەدا.

باب ـ ئەگەر شیعە بێ ـ دەڵێ: **"علي السحاب صلاة ا وسـلامه عليك يـا أم ا ـؤمن "**، موجتەهیدی نەجەفی ئەشرەف و کەربەلای

---

[58]) زۆڵ، منداڵێك كە بە جووتبوونی حەرام خولقابێ. كورد بە هەر كەسێك هارو بێ عار بێ ئەڵێن زۆڵ.

موعەللا وایان فەرموەوە.

مندالْ: ئەلْبەت ئەلْبەت وایە بابە، تەواوە.

کوڕی شیعە زوو بڕوا دەکا، ئەمما منالْی سوننی زرەنگن بە قسەی پڕ و پووچ ناخەلْەتێن ئیللا ئەوانە نەبێ کە وەکو شیعان ئیمانیان بە ئیمام هەیە، بە شێخان بێ ئەوانیش دەگۆڕرێن. دەنا مندالْە سوننی بەتایبەتی مندالْی کوردان قەت لە زەکای **فطـری** خەلقی ناگۆڕرێن، لەسەر ئەو بێ کەسیە ئیمرۆ شوکر مندالْی کوردان بە نەوعێ بۆ ئەوجی ئەعلا دەفڕن هەرچی دۆستە حەق وایە کەیفی پێ بێ، چونکو زۆر باش دەخوێنن، عاقیبەت بۆیان باش ئەبێ.. دەچن بۆ بلْندترین پایە.

هیوای من بەبێچوە کوردان ئەوەیە بەقسەی پڕوپووچ نەگۆڕێن، تەماشای خودای بکەن، خەلق و ئیجادی ئەو بێننە بەرچاو، قەواعدی **فطري** تەماشاکەن. **خوارق العادة**[59] چ نیە.. گوێی نەدەنێ، چی خوا کردبێتی بە عادەت ئەوە باشە، ئەگەر بە عەقلْ تەماشای کەرامەتیان کردبا دەیانزانی فائیدەی چیە، بۆ هەموو شتێ تەشەبوسیان بە کەرامەت نەدەکرد. ئەوە ڕاستە شێخ دەفڕێ بە لۆقێ دەچێتە مەکە و نوێژی سبەینێ لە مەککە دەکات، ئیشراق لە مەدینە، **ضـحى**[60] لە

[59] ) **خوارق العادة**: شتی نابـاو و سەرسوڕهێنەرە، ئەوشتانەی لەباو و عـادەتی مرۆڤدا دوبارە نابێتەوە و لەسەرووی تواناو وزەی مرۆڤەوەیە.

[60] ) چێشتەنگا.

قـــودس، نیـــوەڕۆ لـــە بەغـــدا.. بـــۆ هـــەموو میللـــەت چ کـــەڵك دەگرێ؟!_سوودی چیە؟_ تا ئیمڕۆ حەجاجی قوڕبەسەر پشتی دەشکا، لەسەر حوشتر گەلێکیان بەردەبوونەوە، ئێسك و پروسـکیان ورد دەبـوو، چل پەنجا ڕۆژ بە سواری حوشتر حنـدەر حۆیـان دەکـرد، تـۆك و لۆکیـان دەچوو. ئایا بۆ میللەت فایدەی چی هەیە کە شـێخ فـڕی یـا نـە، چـووە مەکە یا نەچووە مەکە، بفڕێ و نـەفڕێ.. تەماشـای لـەوحی مـەحفوزی کرد، ئەوی تیا بـوو بـۆی کەشـف بـوو، چ سـوودی هەیـە؟ بابـەگوڕگوڕ ئاگری شالاوی هەڵسا، بەغدای ترساند، کە ئاوی نەوتاوی بکا. بـە علـم و فەن و هەندەسە زەوتیان کرد و تەمایانە ئەم نەوتە بۆ ئـەورووپا بـەرن، ئێمە خۆمـان لـەماڵی خۆمانـدا بـێ بـەش بـووین، کەشـفی عیلمیمـان نەبوو، ئەو لەناو عەردی دا بـوو لێمـان بـزر بـوو، ئـەجانب[61] بـەدەریان خست، ئێمەش هەر خەریکی لەوح بووین! قەی ناکات، لـەوێش صـەرفی نەزەر.. ئەم قورئانە لە لوح **المحفوظ** بـۆ پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) هاتـە خوارێ، بۆچی ئەم وەلی و شێخانە تەماشای ناکـەن؟ تەنانـەت کـەمیان

---

[61] ) مەبەستی لەوڵاتە بێگانە داگیرکەرەکانە، وەك ئینگلیزی ئەوسـاو ئـەمریکای ئێستە. کە پیاوی ژیر ئەم قسەیەی مـەلای گـەورە ئەخوێنێتـەوە، کـە نزیکـەی سـێ چـارەکە سـەدە لەمەوبەر نوسیویەتی، گەورەیی عـەقڵی ئەو کەڵەپیاوەو کلۆڵی ئەم میللەتە لەقوڕا چەقیوەی بۆ روون ئەبێتـەوە، چـونکە هـەمان ئـەو دەردەی مامۆسـتای خوالێخۆشـبوو باسـی کـردووە ئێستاش لەکۆمەڵگەدا هەر ماوەو، هەمان عـەقڵی دواکەوتووی گۆڕ پەرسـتی و شـێخو مـێخ بە خوا زانینیش هەر باوو بڵاوە لەنێو خەڵکیدا، سەدئەفسوس و هەزار مەخابن.

بەرِەشخوێنیش دەیزانن.. بە مەعنا هیچ، ئەویش خراپە، نابێ ئەوان، کە ئیمانیان هەیە بە قورئان کە کەلامی خوایە، بیزانن. فکری موسڵمانان هەر بەولاو بەولادا دەفرِێ، بەرِاستی رِوو لە رِێگەی رِاست ناکەن.

فرِێ فرِێ.... بە فکرم هاتەوە: فرِێ فرِێ کەری دەجالی فرِێ، کەری واهروهوپ گوێی ئەوەندە درێژە حەفتا هەزار جوو[62] لەبن سێبەری گوێی دا رِادەوەستێ، شەقاوی لە مەددی نەزەرە[63]، بە چل رِۆژ هەموو دونیا دەگەرِێ، خصوصاً نەرِەدێوێکی وەك دەجالی سواربووە.

منداڵەکە: ئەوا کەرامەتی ئەولیایانمان سەلماند، عەبدی خوا عیبادەتی دەکەن با کەرامەتیان هەبێ. ئەی دەجال، ئەو چیە؟؟ ئەویش خۆشەویستی خوایە؟ خودا ئەو هەموو ئیشانەی بۆ دەکا؟؟ فرِێ فرِێ.. هەموو خەزێنەی دونیایە لەدوای سەری وی وەك زەنگەزوورە، زەردەواڵەو، مێش هەنگوین بە هاژەهاژ و گرمەگرم بە ئەمری وی دەفرِن، ئەمە بۆ فرِێ؟! فرِێ فرِێ ئەم چیایە فرِێ، ئەو چیایە بە ئەمری

---

[62] ) جوولەکە، یەهودی.

[63] ) مەددی نەزەر: تا ئەو شوێنەی چاو برِکات. لێرەدا مامۆستای گەورە ئاماژە بۆ چەند خورافیات و فەرموودەیەکی هەڵبەستراوو درۆ ئەکات، کە بەناو شێخ و کۆلکە مەلاکان بەناوی ئیسلام و فەرموودەی پێغەمبەرەوە لەبارەی دەجالەوە باسی ئەکەن. کەچی دەجال لەرِاستیدا مرۆڤێکی پیسی لەخوا یاخی ئاساییە، کە بەهۆی زانستێکی زۆرەوە خەڵکی لەرِێی خوا چەواشە ئەکات و هیچی نر.

ئەو لەڕەگوڕیشە لەعاردی دێنە دەرێ بە حەوا دەکەون، دەفڕن دەفڕن وەك دوو بەران شەڕە قۆچی دەکەن، لەم بەرو لەوبەر.. ئەمە بۆ کەس نەبووە، کوو ڕێك دەکەوی؟!!

گەورەکان: برای باوکم ئێمە موسڵمانین بە قەولی مەلایان موسڵمانین، ئەوی ئەوان فەرموویانە بڕوا دەکەین، حەتا دەفەرموون ڕووبارو نان و گۆشتی بەدودا دەڕوا.

منداڵەکە: چی رووبار؟ چی نان؟ چی گۆشت؟ بەخوا ئەمە قسەیەکی سەیرە، خۆزیا ئەمن لەناو ئێوە گەورە نەبووبام و ئەم تەرزە قسانەم نەبیستبا لەئێوە. هەرچی مەلا بیڵێ ئێوە دوای قسەی بکەون ئەوە قەت نابی. ئەمە دیارە مەلا زۆر برسیە، بێ نانە، ئاردی لەماڵا نیە، لەمێژە گۆشتی نەخواردیە، تامەزرۆیە، خەون بەنان و گۆشتەوە دەبینێ(**ا لنا والشر لأعدائنا**).. لام وایە تەفسیری ئەم خەونە ئەوەیە ئیمڕۆ و سبەی کێخوا_کوێخا_ خێر بۆ خۆی دەکا، دوسێ حەیوان سەردەبرێ، دەیکا بەکەشکەك و مەلای دەعوەت دەکا، سەلەی پڕ لەنان و تەبەقی پڕ لەچێشتی لەبەردەمی دادەنێن، مەلا عافیەتی دەکا، لاڕانێکیش دەنێرێتە ماڵی مەلا، مەلاش نەختێ بەکولاوی و هەندێکیش بەبرژاوی یەك دووزگی تریشی لێ دەخوا. یا کەسێ بووە

وەکو بسحاق[64] ئەویش حەزی لە **طعام** بووە ئەمما بوسحاق چاکە، باسی **طعامی** خۆش خۆش دەکا واقعاً، ئەویش حەزی لە قاورمە بوو لەگەڵ ساوەری رزی رەواندزیان. ئەمە ئەوەندە نان و گۆشتە بۆ تریت خۆرەکانە، ئەوە لە مەلای چاك دوورە، گۆشت و نان و حەز بەدرۆی هەڵبەستراو: خیاڵ وخولیای برسیانە، دوورە لەپێغەمبەر، چونکە پێغەمبەر وەحی لەخوا وەردەگرێ، تەشریعی ئەحکام ئەکا، دوورە لەم نەوعە قسە پڕو پووچانە **خصوصاً** تەعریف و تەوسیفی کەری دەجال، یاخوا لەعنەتی خوا لەو کەسەی بێ کە درۆی بە زاری پێغەمبەری هەڵبەست و عالەمی ماڵوێران کرد، کردنی بە کەری نەفامی هیچ نەزان.. برای باوکم! وەرنەوە سەرحاڵی مندالّی بەخوا زۆر باشترە. فڕی فڕی قەل فڕی، دەست هەڵبڕن، فڕی فڕی قول فڕی، دەست هەڵ مەبڕن، مەبەستی لە قولە ڕەشەیەو نافڕێ، وە ئیللا سەروبن دەبن وەك هاروت وماروت، سەرەوژێر هەڵدەواسترێن.. بەڵێ، ئەویش حیکایەتێکی زەمانی پیرییە، موسڵمانان کە گەورە بوون گوێیان و عەقڵیان تەواو دەبێ، ئیمانیان بە قووەت دەبێ، ئەمجا بەهەموو عەجائیب و غەرائیب بڕوا ئەکەن! خۆشناوێك مەتحی کەری خۆشناوێکی تری دەکرد، دەیگوت بەخوا کەری تۆ زۆر دەنگی خۆشە، ئەویش تەشەکوری ئەکرد دەیوت:

---

[64] ) ناوی پیاوێکە.

ماڵت سەدجار ئاوابی، هیچ چاکەم بۆ تۆ نیشە، ئەوا هەر لە پیاوەتی خۆتەوە مەتحی کەرێم ئەکەی. موسڵمانانیش سەدجاران ماڵیان ئاوابی، دەجال هیچ پیاوەتیشی بۆ ئەوان نیە، کەچی مەدحی کەرەکەی دەکەن!!

فێڵێك هەیە لەناو کوردان کۆتر فڕینکێی پێ دەڵێن، وادەبێ کچەکی گچکە دەدەنە پیاوێکی زەبەلاح، لێی مارە دەکەن، بۆی دەگوێزنەوە و کچەکە لێی دەترسێ، هاوار هاوار دەکاو بۆی ڕاناوەستێ ئیشی خۆی لەگەڵ بکا، ئاخری کۆتر فڕنکێی پێ دەکا، شەوێ یا ڕۆژێ گەمەی لەگەڵ ژنەکەی دەکا، دەڵێ: وەرە کۆتر فڕینکێت پێ بکەم.. بۆ خۆت دەفڕی.. دەچیتە دەرەوە، ئەویش پێی خۆش دەبی.. دەڵێ: باشە. بە پەتێکی دەست و قاچی و پێی دەبەستێتەوە و ئیشی خۆی لەگەڵ دەکا، دیارە ئەوی لاقی ببەسترێ چی بەسەر دێت! ئیتر لازمە ئینسان ئاگای لەدەست و لاقی خۆی بێت، وە ئیللا تێدەکەوێ.

بەڵێ ئەگەر ئەمڕۆ بڵێین: عەقڵ لەنێو موسڵمانان فڕی، ڕاستە.. گورج دەست هەڵبڕە و ئەگەر بڵێین: علم و زانین لەنێو کوردان فڕی، وایە.. خێرا دەست هەڵێنە، هیچ ڕامەوەستە، نە علم نە عەقڵ نە فکری تەنقید و محاکەمە لەناو موسڵمانان خصوصاً لەناو کوردان ـــئەوانی کە تابعی شێخانن ـــ نەمایە، فڕییە، ڕۆیشتیە، لام وایە نایەتەوە مەگەر منداڵانێ کە تازە پێدەگەن فێڵەکی بکەن، فاقەو داوێکی دابنێنەوە، بەڵکو تەیری علم و عەقڵی پێوە دەبی و

دەیگرنەوە.. ئەویش لازمە باوکەکانیان لێیـان گـەڕێن لەسـەر عـەقڵی فیتری گەورە بن، لێیان نەگۆڕن.

خودا بە مەرحەمەتی خۆی عەقڵێکی چاکمان پێ کەرەم کا. ئامین...

## بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەکەم) | جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان (کتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |

| | | |
|---|---|---|
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامانو سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵلا و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەلامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوڵلا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پاڕەزانی |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵلا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب ڕەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵلا |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: ڕەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |
| ٤٦ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە)<br>قانع خورشید پێشەکی بۆ نووسیوەو ڕێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |